# ئادابی کۆمەڵایەتی

## لە قورئان و سوننەتدا


ئامادەکردنی

نەوا محمد سعید







2009



# ئادابی کۆمەڵایەتی

# لە

# قورئان و سوننەتدا


ئامادەکردنی

نەوا محمد سعید






بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

١٤٣٠ - ٢٠٠٩

ناوی نامیلکە: ئادابی کۆمەڵایەتی لە قورئان و سوننەتدا

ناوی نوسەر: نەوا محمد سعید

چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو راگەیاندن/ هەولێر

خەت: نەوزاد کۆیی

بەرگ: ئەمین مخلص

دیزاینی ناوەوە: عزالدین محمد

نۆرە و ساڵی چاپ: ٢٠٠٩ز- سێیەم ١٤٣٠ك

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧٨٤) ساڵی ٢٠٠٥ی دراوەتێ

تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن

هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨

مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١

tafseeroffice@yahoo.com

tafseeroffice@maktoob.com

altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

## پێشەکی:

**الحمدلله الصلاة والسلام على رسول الله محمد صلى الله عليه وعلى آله وصحبه وسلم.**

لە نێوان هەردوو کەس، دوو هاورێ، دوو کۆمەڵ وا دەخوازێ جۆرە مامەڵەیەكو هەڵسوکەوتێك هەبێ، تا ڕەوڕەوەی کاریان بە شێوەیەکی سانا بڕوات بەڕێوە. دیارە چۆنیەتی مامەڵەو ڕەفتار لەگەڵ یەکتری تەنها خوای دەروونناس دەیزانێ، چ مەنهەجو یاسایەك دابنێ، کە جوانکاری تیا بێو مەردومەکان لێك زویر نەبنو ڕێزی یەکتری بگرن، لەبەر ئەوە بەندە بە ئەرکی سەرشانی خۆی زانی، کە هەڵسێ بە ئامادەکردنو هەڵبژاردنی ئادابی سەرەکی کۆمەڵایەتی ئیسلامی بەپێی قورئانو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆ ئەوەی ئەم ئادابو رەفتارە جوانو ڕازاوانەی ئیسلام بەرجەستەی خەڵك بکرێو زیندوو بکرێتەوە، چونکە لەم ڕۆژگارەی ئێستادا زۆر لە

مسوڵمانان ئەم ئادابە ئیسلامیانەیان فەرامۆش کردووەو لەژیانی ڕۆژانە پیادەی ناکەن، کە شێوازی شارستانیەت پیشان دەدات.

لە خوای بەخشندە دەخوازم ئەم بەرهەمە بچوکەم بۆبکاتە (صدقة جارية)و لە گوناهە زۆرەکانم خۆش ببێو نیەت پاکیو خواویستیم پێ ببەخشێ، وام لێبکات کاری خێروچاکە ئەنجام بدەمو، مەبەستم تەنها ئەوبێت.

نەوال محمد سعید
٢١/شوال/١٤٢٦ك
٢٠٠٥/١١/٢٣ز

# ئادابی ئیسلامی لە کۆمەڵگا

شێوازی هەڵس‌وکەوت‌و ڕەفتار لە نێو کۆمەڵگادا، پێناسەو ماهیەت‌و ناوەڕۆکی گشت ڕێبازو بەرنامەو فیکرە یەك بەدەردەخات. ئیسلامیش کە تاکە بەرنامەی داڕێژراوو بێ‌وێنەی پەروەردگارە، خاوەنی چەند ئاداب‌و ڕەفتارو خووڕەوشتێکی شارستانیەتە، کە لە هیچ بەرنامەی تر بەرجەستە ناکرێ.

ئەم ئاداب‌و ڕەفتارە کۆمەڵایەتیە ئیسلامیانەش، کە لە خوارەوە دەیان هێنینە سەر سفرەی باس، پێویستە مسوڵمانان بە گشتی‌و بێ درێغی‌و کەم‌وکورتی لەنێو خۆیان‌و کۆمەڵدا پیادەی بکەن‌و، بیسەلمێنن کە تەنها ئیسلامە تاکە بەرنامەی نوێ خوازو شارستانیەت، بەرنامەیەك نیە خۆی دوورە پەرێز کات لە کۆمەڵگاو گۆشە نیگاو وشك بێتە بەرچاو.

ئەم ئاداب‌و ئاکارو ڕەوشتانەی باس دەکرێن، بەرنامەی کاری ڕۆژانەی مسوڵمانە، کە دەبێ‌و پێویستە پێوەی پابەند بێت‌و ئیسلامێکی جوان پیشان بدات، کە خەڵك چاوی لێ‌بکەن.

جا مسوڵمان، هەموو قورئانی لەبەربێت، یا (صحیح البخاري ومسلم)ی لەبەربێت، بەڵام لەگەڵ خەڵکی وتە ناخۆش‌و قسە ڕەق بوو، هەست بریندارکەر بوو، ئازاری دڵی خەڵکی دەداو...هتد، ئەوا ئەم قورئان لەبەرکردن‌و فەرموودە لەبەرکردن هیچ سودی نیە، چونکە قورئان‌و سوننەت بۆ پیادەکردن هاتوون؛ نەك بۆ خۆهەڵکێشان‌و تەنها خوێندنەوە.

دیاریشە، کە ئیسلام بە جیهان بڵاوبۆوە، بەهۆی ئاکارو ڕەفتار جوانی بازرگانە مسوڵمانەکان بوو، ئەگینا خەڵك نەهاتن دیراسەی ئیسلام بکەن، ئنجا مسوڵمان بن.

ئیسلام وتەو کردارە، ڕەوشت‌و ڕەفتاری جوانە، ڕەچاوکەری هەستەکانە، ،افدەری مافانە، کەواتە

مسوڵمانیش دەبێ ڕەنگدانەوەی ئەم ئیسلامە بێت‌و ئادابەکانی جێبەجێ بکات، وەك لە خوارەوە باس دەکرێن:

١- ئەدەب‌و ئاکاری مسوڵمان لەگەڵ خوادا.
٢- ئەدەب‌و ئاکاری مسوڵمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ.
٣- ئەدەب‌و ئاکاری مسوڵمان لەگەڵ دایك‌و باوکی.
٤- ئەدەب‌و ئاکاری مسوڵمان لەگەڵ خزم‌و نزیکانی.
٥- ئەدەب‌و ئاکاری مسوڵمان لە میوانداری.
٦- ئەدەب‌و ئاکاری مسوڵمان لە بەکارهێنانی تەلەفۆن‌و موبایل دا.
٧- ئەدەب‌و ئاکاری مسوڵمان لەکاتی نان خواردندا.
٨- ئەدەب‌و ئاکاری مسوڵمان لە کاتی خواردنەوەدا.
٩- ئەدەب‌و ئاکاری مسوڵمان لە کاتی سڵاوکردندا.
١٠-ئەدەب‌و ئاکاری مسوڵمان لە کاتی مۆڵەت وەرگرتندا.
١١- ئەدەب‌و ئاکاری مسوڵمان لە کۆڕو مەجلیسدا.
١٢- ئەدەب‌و ئاکاری مسوڵمان لە کاتی قسەکردندا.

١٣- ئەدەب و ئاکاری مسوڵمان لە گاڵتەو سوعبەتدا.

١٤- ئەدەب و ئاکاری مسوڵمان لە کاتی پیرۆزباییدا.

١٥- ئەدەب و ئاکاری مسوڵمان لە کاتی سەردانی نەخۆشدا.

١٦- ئەدەب و ئاکاری مسوڵمان لە کاتی پرسەو تەعزیەدا.

١٧- ئەدەب و ئاکاری مسوڵمان لەکاتی پژمین و باوەشکدان.

## ئـەدەب و ئاکاری مسـوڵمان لەگەڵ خـوادا

دیارە گەر چاکە لەگەڵ یەکێك کرا، ئـەوا ڕێـزو ئـەدەب بەرامبەر بـە چـاکەکارەکە دەنـوێنرێ، پێویستیـشە ڕێـزو ئەدەبی بەرانبەر بنوێندرێ.

لە هەموو کەسیش شایستەترو پێویستتر، ڕێزو ئەدەبی بەرانبـەر بنوێنـدرێ؛ خـوای بەخـشندەیە، کـە چـاکەو بەخششەکانی نایەتـە ژمـاردن ﴿وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا إِنَّ اللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨﴾ النحل ....ئەگـەر هەرچی چاکەی خودایە بژمێرن، لە ژماردن دوایی نایە﴾.

ئەدەبو ئاکاری بەرزنواندن بەرانبەر بە خوای بەخشش کار بەم شێوەیە:

١- بەندایەتی کردنیو پەرستنی:

ئەمـەش بـەوە دێتـەدی، کـە بـە تـەواوی ملکەچـی فەرمانەکانی بیتو بـە گـەورەی دابنـێی لـە هـەموو کارێکدا.

دیارە پەرستنیش تەنها لە نوێژو ڕۆژووو حەج و زەکات کورت هەڵنەهاتووە، بەڵکو مانا فراوانەکەی پەرستن ئەوەیە، کە مرۆڤی مسوڵمان هەر کارێك ئەنجام دەدات، لە کاری ڕۆژانەی لەگەڵ ماڵ و منداڵی، لەگەڵ هاوڕێکانی، لە کڕین و فرۆشتنی و، لە کاری فەرمانبەریی و مامۆستایەتی، مەبەستی پێ ڕەزامەندی خوا بێت و بە پێی بەرنامەو مەنهەجی شەریعەتی خوا بێت.

جا کە پەرستن (العبادة) ئەم مانا فراوان و گشتگیریەی هەبێت، ئەوا خوای بەخشندە کردویەتیە مەبەستی بەدیهێنان و هێنانەبون، وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ الذاریات ...من هەر بۆیە جنۆکەو مرۆم دروست کرد، تابمپەرستن﴾.

شەرع ناسانیش ئەم فیکرەیان بەم گوتەیە گوزارش کردووە، کە دەڵێن: (النیة الصالحة تقلب العادة عبادة.... نیەت پاکی و باشی، عادەت و خوو نەریت بۆ پەرستن وەردەچەرخێنێ، کەواتە نان خواردنمان بە

مەبەستی بەهێزبون بۆ جێبەجێکردنو پیادەکردنی فەرمانەکانی خوا، عیبادەتە، خوێندنو فێرخوازی بە مەبەستی خزمەتکردن بە مسوڵمانان، عیبادەتە، جیهادو خۆبەختکردن لە پێناوی بەرزکردنەوەی دینی خوا، عیبادەتە، لابردنی شتێك لە ڕێگا، کە ئازار بە مسوڵمانان بگەیەنێ، عیبادەتە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّما الأعْمالُ بالنيّات، وإنَّما لكلِّ إمرئٍ ما نَوى، فمن كانت هجرته الى الله ورسوله فهجرته الى ما هاجر الى الله ورسوله، ومن كانت هجرته الى دنيا يصبها، أو إمرأة ينكحها فهجرته الى ما هاجر إليه... بەڕاستی ئەنجامدانی کردەوەکان بە پێی نیەتەکانە، هەرکەسو بە پێی نیەتی خۆیەتی، هەرکەسێ کۆچکردنی بۆ خواو پێغەمبەرەکەی بێت، ئەوا کۆچەکەی بۆ خواو پێغەمبەرە، هەرکەسێکیش کۆچەکەی بەمەبەستی دەستکەوتنی دنیا بێت، یان بۆ ئەوەی ژنێك مارە بکات، ئەوا کۆچەکەی بۆ ئەو مەبەستەیە، کە کۆچی بۆ کردووە)). متفق عليه.

## ٢- تاعـــەت‌و گوێڕایەڵی:

گوێڕایەڵی خوا بەجێبەجێ‌کردنی فەرمانەکانی‌و یاسـا بــەپیزەکانی دێتــەدی، هــەروەها بەدورکەوتنــەوە لــەو کارانەی قەدەغەو حەرامی کردون.

هەندێ لە زانایان تاعەت، بـە بـەردەوام بـون لەسـەر کاری چاکەو پیادەکردنی بەرنامەی خوا راڤـە دەکـەن. ﴿فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ....﴾(١١٢) هـود. هــەروا خــوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾(٣٠) فـصلت ...ئەوانەش کە گوتویانە: پەروەردگارمان خودایــەو لــە گفتیان لایان نەداوەو بەردەوام بون لەسەر کاری چـاکە؛ فریشتە دێنە لایان‌و پێیان دەڵێن: نە بترسـن، نــە خــەم بخۆن؛ مژدەتان لــێ‌بێ گەیشتونە ئــەو بەهەشــتەی، کــە بەڵێنتان پێدراوە﴾.

تاعــەتی خــوا بەڵگــەی ڕاســتیی خۆشویــستنە، سەرپێچیو گوناهیش بەڵگەی ناڕاســتی خۆشویــستنە. گوتراویشە: (إن المحب لمن يحب مطيــع... ئــەو کەسـەی یەکێکی خۆش بوێ بەگوێی دەکات).

خــوا بەخــشندەش بــەڵێنی بــە بەنــدە گوێڕایەڵــە خۆشەویــستەکانی داوە، کــە بەهەشــتی ڕازاوەیــان پێبەخــشێت، وەك دەفــــەرموێ: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴿٦٩﴾ النــساء ....هەرکەســێکی بەرفــەرمانی خوداو ئەم پێغەمبەرەبێ، دەبێتە هاوڕێی ئەوانەی خودا چــاکەی دەگــەڵ کــردون؛ لــە ڕیــزی پێغەمبــەران، خوداپەرســتانی ڕاســتیو شــەهیدانو پیاوچــاکان؛ چ هاوڕێیانێکی چاکیشن ئەمانە!﴾.

هەروا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ...﴾ (٣١) آل عمران...
بڵێ: ئێوە ئەگەر خوداتان خۆشدەوێ، شوێن من کەون، هەتا خوداش خۆشی بوێن و لە گوناهانشین ببورێ﴾

٣- شەرم کردن لە خوا:

شەرم کردن لە خوا لە گرنگترین پایەی ڕێزو ئەدەبە بەرانبەر بە خوای گەورە.

(الحياء) شەرم لە زمانەوانیدا مانای پۆشتەیی، هەروا مانای خۆدەرنەخستن، یان ڕازی نەبونە بە شتێك، کە پێچەوانەی شەرعی خوایە، یان بە ئاشکرا ئەنجام نەدانی سەرپێچی و گوناهوتاوان.

هەندێ لە زانایان پێناسەی شەرم (الحياء)یان بەوە کردووە، کە: ڕەوشت و ئاکارێکە بۆ وازهێنان لە کاری ناشیرین و، کەمتەرخەمی نەکردن بەرانبەر بەخاوەن ماف.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بەوە کردووە، کە شەرم خێرو چاکەی بەدواوەیە. عیمرانی کوڕی حەصین -خوا لێی ڕازی بێ- گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ

فەرموویەتی: **((الحیاء لا یأتي إلاّ بخیر))** متفق علیه.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمودەیەکدا ڕاڤەی شەرم (الحیاء) دەکات و دەفەرموێ: **((إستحیوا من الله حق الحیاء، قلنا إنا نستحي من الله یا رسول الله والحمدلله، قال: لیس ذلك، الإستحیاء من الله حق الحیاء: أن تحفظ الرأس وما وعی، والبطن وما حوی، وتذکر الموت والبلی، ومن أراد الآخرة وترك زینة الحیاة الدنیا، وأثر الآخرة علی الأولی، فمن فعل ذلك فقد استیحی من الله حق الحیاء...))** وەك پێویست لە خوا شەرم بکەن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، سوپاس بۆ خوا ئێمە شەرم لەخوا دەکەین، فەرموی: ئەوها نا. شەرم کردن لە خوا وەك پێویست ئەوەیە، کە سەرت و چاوو گوێچکەو زمانت لە گوناهان بپارێزی، زگت و ئەوەی لەگەڵ زگدایە لە گوناهان بپارێزی، هەروا یادی مردن و ڕزین بکەیت، هەرکەسێ ڕۆژی دوایی بوێ و جوانی و ڕازاوەیی دنیا واز لێ بێنێ و بەسەر دنیا هەڵبژێرێ، جا هەرکەسێ ئاوای کرد، ئەوا وەك پێویست شەرمی لە خوا کردووە)) رواه الترمذي عن ابن مسعود.

ئەبولەیسی سەمەرقەندی (شەرم)ی بە دووجۆر داناوەو گوتویەتی: شەرم دوو جۆری هەیە:

١- شەرمێك لەنێوان خۆتو خەڵکدا.

٢- شەرمێك لەنێوان خۆتو خوادا.

شەرم کردن لەنێوانو خۆتو خەڵك ئەوەیە، چاوت بپارێزی لەو شتانەی بۆت حەڵاڵ نیە تەماشای بکەیت. بەڵام شەرمی نێوان خۆتو خوای گەورە بریتیە لە هەست کردنو پێزانین بە بەخششەکانیو، شەرم بکەیت سەرپێچی فەرمانەکانی بکەیت.

٤- شوکرانەبژێری بەخششەکانی خوا:

سوپاسگوزاریو شوکرانەبژێری، یان بەدڵ، یان بە زمان، یان بە کردەوە دەردەبڕدرێ.

شوکرانەبژێری بەدڵ بریتیە لە هەبونی هەستی خێروچاکە نواندن بۆ هەموو خەڵك، چونکە هەموو خەڵك چاو لەدەستی خوانو خۆشەویسترین کەس لای خوا، ئەو کەسەیە بۆ چاو لەدەستەکانی سودمەند بێت.

شـــوكرانەبژێری بـــەزمان بریتیـــە لـــە ســـوپاس و ستایـشكردنی خـوا، هـەروا بـەردەوام زیكروپاڕانـەوەو تەسبیحات كردن.

شـــوكرانەبژێری بـــە كـــردەوەش بـــەوە دێتـــەدی، كـــە ئەندامەكانی جەستە لە جێبـەجێكردنی فەرمانـەكانی خوا بەكاربهێنرێت و، سەرپێچی خوای پێنەكرێت.

دیـــارە شـــوكرانەبژێری نیعمـــەتی چـــاو بریتیـــە لـــە پاراستنی و دانەواندنی لەئاست ئەو شتانەی خوا حەرامی كـردوون، وەك تەماشـانەكردنی ئـافرەتی نامـــەحرەم و گۆڤارە ڕوت و نیمچە ڕوتەكان و فلیمە بێئابڕووەكان.

شوكرانەبژێری زمانیش بریتیە لە غەیبـەت نـەكردن و دوزمانی نەكردن و قسە نەهێنان و نەبردن و تێك نـەدانی نێـــوان دوكـــەس و فیتنـــەیی نـــەكردن و هەســـت بریندارنەكردنی خەڵك و تەریق نەكردنەوەیان.

شوكرانەبژێری هێزو تواناش بریتیـە لـە سەرخـستنی چەوسـاوان و زوڵـم نـەكردن و خـــەبات و تێكۆشـــان لەپێناوی خوا.

شوکرانەبژێری نیعمەتی دارایی‌و دەوڵەمەندی بریتیە لە یارمەتیدان‌و کۆمەکی هەژارو نەداران، بەبێ منەت کردن‌و بەچاو دادانەوە.

خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿...لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ ... ﴿٧﴾ إبراهيم ... گەر شوکرانەبژێرم بن بۆتان زیاد دەکەم﴾.

٥- ڕازی بون بەقەزاو قەدەری خواو ئارام گرتن لەکاتی بەڵاو ناخۆشیدا:

باشترین وتە سەبارەت بە قەزاوقەدەر فەرمودەکەی پێغەمبەرە ﷺ، کە ئاڕاستەی ئیبن عەبباس دەکات‌و دەفەرموێ: ((**يا غلام إني أعلمك كلمات: إحفظ الله يحفظك، أحفظ الله تجده تجاهك، إذا سألت فاسأل الله، وإذا إستعنت فاستعن بالله، واعلم أن الأمة لو إجتمعت على أن ينفعوك بشيء لن ينفعك بشيء قد كتبه الله لك، ولو إجتمعوا على أن يضروك بشيء، لن يضروك بشيء قد كتبه الله عليك، رفعت الأقلام وجفت**

الصحف))... کوڕیژگە! چەند وشەیەکت فێردەکەم: دینی خوا بپارێزە، خوا دەتپارێزێ، خوا بپارێزە، خوا بەرەو ڕوت دێ، گەر داوای شتێکت کرد، تەنها لە خوا داوابکە، گەر داوای فریاکەوتنت کرد کە بە فریات بێ، تەنها هاواری خوا بکە، بزانە گەر هەموو خەڵکی کۆببنەوەو بیانەوێ سودێکت پێ ببەخشن، کە خوا نەینوسیبێ، ناتوانن سودت پێ ببەخشن، هەروەها هەموی کۆببنەوە بیانەوێ زیانت پێبگەیەنن، کە خوا نەینوسی بێ، ئەو زیانەت پێناگات، قەڵەمەکان لە نوسین هەڵگیراون و پەڕاوەکانیش وشك بونەوە (واتە: قەزاو قەدەری خوا بڕاوەتەوە). رواه الترمذی وقال: حدیث حسن صحیح.

کەواتە: بابای مسوڵمان وەك ئەدەب و ڕێزنواندن بەرانبەر خوای خۆی، ڕازییە بە هەر چ شتێك بەسەری بێت، کە خوا بڕاندوویەتیەوەو پاداشتیشی لەسەر وەردەگرێتەوە، هەرگیز نارەزایی بەرانبەر بە خوا دەرنابڕێ، کە بۆچی ئەم بەڵاو ناخۆشیەی بەسەر

هێناوە، بەڵکو دڵی بەم ئایەتە دەداتەوە کە دەفەرموێ:

﴿...وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ البقرة

... مژدە بدە بەو کەسانەی خۆڕاگرن، ئەو کەسانەی کە توشی چۆرتمێك دەبن، دەڵێن: ئێمەش هەر ئی خواین‌و هەر بۆ لای ئەو دەچینەوە، خێروبێرو بەزەیی پەروەردگاریان بۆ دەبارێ‌و شارەزا لە ڕێ ئەوانن.﴾

## ئـەدەب و ئاكاری مسـوڵمان
## لەگـەڵ پێغـەمبەری خـوا ﷺ

دیارە مسوڵمانی پابەند بەدینی خواو ژیرو لـەخواترس، هەست بەو پایەو ڕێزەی پێغەمبـەر دەكـات، كـە لەلایـەن خوای گەورەوە لێی نراوە.

هەست دەكات پێغەمبەرێكە هەر لە سەرەتای ژیانی تا كۆتا ژیانی، خاوەنی ڕەوشـت بـەرزیو قوربانیـدان بـووە، هەردەم بەخەمی ئوممەتەكەیەوە بووە، كە خوای بەخشندە لە ئوممەتەكەی خۆش ببێو چاوپۆشی لە گوناهەكانیان بكات.

جا پێغەمبەرێك خوای خاوەن شكۆ دەربارەی بفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ القلم ... بەڕاستی تۆ ئاكارو ڕەوشـتت زۆر بـەرزە﴾. ئەمـە گـەورەترین بڕوانامـەو مەدالیایە بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێویستە ڕێـزی لـێ بگیرێو ئەدەبی لە بەرانبەردا بنوێنرێ.

ڕێزگرتن‌و ئەدەب نواندنیش فەرمانێکی خوایە، کە دەبێ گشت بڕوادارێك پیادەی بکات‌و پێغەمبەری لەلا خۆشەویست بێت، ئەوپەڕی خۆشەویستی، دەنگی بەسەردا بەرزنەکرێتەوە وەك خـوا(جلّ جلاله) دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ٢﴾ الحجرات...ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! ناشێ دەنگتان سەر دەنگی پێغەمبەر کەوێ. دەنگیش هێندە بەرزمەکەن وەك لەگەڵ یەکترا قسە دەکەن، کە کارتان لـێ پوچەڵ ببێ‌و خۆتان بەخۆتان نەزانن﴾.

**ئەدەب‌و ڕێزنواندن بەرانبەر بە پێغەمبەری خـوا ﷺ بەم شێوەیە دەبێت:**

١- گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەرو شوێنکەوتنی لـە گـشت کاروبارەکـانی دنیـاو ئاخیـرەت، خـوای گـەورە دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَـٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾ محمد﴾.

گوێڕایەڵی کردن‌و بەرفەرمانی پێغەمبەر، مسۆگەری بەهەشتەو سەرپێچی کردنیشی، مسۆگەری دۆزەخە، وەك لە ئەبوهورەیرە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((**كلّ أمتي يدخلون الجنّة إلاّ من أبى، قيل أو من يأبى يا رسول الله؟ قال: من أطاعني دخل الجنّة، ومن عصاني فقد أبى....** هەموو ئوممەتی من دەچنە بەهەشت، مەگەر ئەو کەسەی خۆی نەیەوێ بچێتە بەهەشت. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا: کێ هەیە نەیەوێ بچێتە بەهەشت؟ فەرمووی: هەرکەسێ گوێڕایەڵی‌و بەقسەی من بکات، دەچێتە بەهەشت، هەرکەسێکیش سەرپێچی من بکات‌و بەقسەم نەکات، ئەوا نایەوێ بچێتە بەهەشت)) رواه البخاري.

سەبارەت بە شوێنکەوتنی پێغەمبەر لە هەموو کاروبارێك، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ

﴿تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ....﴾ (٣١) آل عمران... بلّێ: گەر بەڕاستی خواتان خۆشدەوێو شوێنی من بکەون، خوا خۆشتانی دەوێو لە گوناهیشتان خۆشدەبێ﴾.

٢- هیچ کەس هێندەی پێغەمبەری ئازیز، خۆش نەویستریێ، تەنانەت دایكو باوکیش. واتا خۆشەویستی پێغەمبەری نازدار پێش خۆشەویستی دایكوباوكو هەمووکەسێکە، وەك خۆی ﷺ دەفەرموێ: ((**والذي نفسي بيده لا يؤمن أحدكم حتّى أكون أحبَّ إليه من ولده و والده والناس أجمعين**...سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە، ئیمانی هیچ کامێکتان تەواو نابێ، هەتا منی لە منداڵیو باوکیو هەموو خەڵك خۆشتر نەوێت)) متفق عليه.

کەواتە، ئەو کەسەی پێغەمبەری ﷺ وەك پێویست خۆشنەوێ، ئەوا ئیمانی تەواو نیەو دەبێ چاوبەخۆیدا بخشێنێتەوە.

٣- هیچ کەس بە سەردارو پێشەواو ڕابەرو سەرکردەی ڕاستەقینە دانەنرێ، جگە لە پێغەمبەر، چونکە خوا ئەوی هەڵبژاردووەو ئەم نازناوانە هەر لەخۆی دێ. خوا دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ الأحزاب:...بێگومان پێغەمبەری خودا سەرمەشقی چاکە بۆ ئێوەو بۆ هەرکەسێ کە بە خوداو ڕۆژی سەلا هیوادارەو هەر خەریکی یادی خوایە﴾.

٤- ڕازی بون و ملکەچی هەر حوکمێک و بڕیارێک، کە پێغەمبەری خوا بڕاندویەتیەوە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ النساء... نەخێر (وانیە کە خۆیان بە باوەڕدار پیشان دەدەن) سوێند بە پەروەردگارت، بڕوادار نین، تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر

ئاژاوه‌و دوبه‌ره‌كيه‌كى نێوانياندا، له‌پاشان هه‌ست نه‌كه‌ن له‌ ده‌روياندا به‌هيچ بێزارييه‌ك له‌و بڕياره‌ى تۆ داوته‌. ملكه‌چ نه‌كه‌ن به‌ ملكه‌چيه‌كى ته‌واو.

ئه‌م حوكم و ياسايه‌، تا ڕۆژى دوايى، به‌رده‌وامه‌. بۆيه‌ هه‌ر كێشه‌و گرفتێك بێته‌ پێشه‌وه‌، ده‌بێ بۆ قورئان و فه‌رموده‌كانى پێغه‌مبه‌ر بگه‌ڕێنرێته‌وه‌، نه‌ك بۆ ياساى ده‌ستكردى مرۆڤى عه‌قلّ سنوردار. خواى گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿...فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۝٥٩﴾ النساء... گه‌ر له‌ شتێك ناكۆك بون و كێشه‌ هاته‌ پێشه‌وه‌، ئه‌وا بۆ حوكمى خواو پێغه‌مبه‌رى بگه‌ڕێننه‌وه‌﴾.

٥- خۆشويستن و دۆستايه‌تى كردنى ئه‌و كه‌سانه‌ى پێغه‌مبه‌رى خوا خۆشى ده‌وێن، هه‌روا خۆش نه‌ويستن و دۆستايه‌تى نه‌كردنى ئه‌وانه‌ى پێغه‌مبه‌ر خۆشى ناوێن و ناحه‌زه‌ پێيان. هه‌روا دڵخۆش بون به‌و شتانه‌ى پێغه‌مبه‌ر پێى دڵخۆش بووه‌، حه‌ز نه‌كردن به‌و شتانه‌ى

حەزی پێنەکردوە. بۆیە ﷺ فەرمویەتی: ((...**فإذا نَهَيتُكُمْ عَنْ شيءٍ فاجتنبوه وإذا أمَرْتُكُمْ بِأمرٍ فأتوا منه ما استطعتم**...گەر لە شتێك قەدەغەم کردن، لێی دورکەونەوە، گەر فەرمانم بە کارێکیش کرد بیکەن، ئەوا بەپێی تواناتان جێبەجێی بکەن)) متفق عليه.

٦- هەرکاتێ ناوی پێغەمبەر هات، دەبێ بگوترێ: (صلّى الله عليه وسلم)، چونکە خوای بەرزو مەزن فەرمانی کردووە سەڵاواتی بۆ بنێردرێ وەك دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦﴾ الأحزاب ...خواو مەلائیکەتەکانی سەڵاوات ئەدەن لەسەر پێغەمبەر، ئەی کەسانێ بڕواتان هێناوە سەڵاوات لەسەری بدەنو سەلامی لێبکەن بە سەلام لێکردنێکی گرنگ﴾.

دیارە سەڵاواتی خوا لەسەر پێغەمبەر وەسفو سەناو باس کردنیەتی بە چاکە لەناو کۆمەڵی هەرە بەرزی

مەلائیکەدا، سەڵاواتی مەلائیکە، تزاکردنیانە بۆی لەلای خوا.

٧- زیندوکردنەوەی سونتەتەکانی پێغەمبەر، وەك: ڕیش و سیواك و هاوشێوەکانی و گەیاندنی بانگەوازەکەی بە خەڵك، هەروا خۆ دروخستنەوە لەو شتانەی ئەو لە دیندا نەیکردووە، خوا دەفەرموێ: ﴿...وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ...﴾ (٧) الحشر ...ئەوەی پێغەمبەر هێناویەتی لە حوکم و یاساو ئاکاری جوان وەریگرن و جێبەجێی بکەن، ئەو شتانەش کە لێتان قەدەغە دەکات مەیکەن و وازی لێبهێنن﴾.

خۆیشی ﷺ دەفەرموێ: ((علیکم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدین المهدیّین، عَضّوا علیها بالنواجذ، وإیّاکم ومحدثات الأمور فإن کلّ بدعة ضلالة...دەست بە ڕێبازو سوننەتمەوە بگرن، هەروا دەست بە ڕێو شوێنی خەلیفە سەرڕاستەکانم بگرن، بە ددانەکان بیگرن، نەکەن لە کاروباری دیندا، شت دابهێنن، چونکە هەموو شت داهێنانێك لە دین گومرایی و

سەرلێشواویە)) رواه أبو داود والترمذي وقال حديث حسن صحيح.

خاتوو عائیشە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: (( من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو ردٌّ... هەرکەسێ لەم کارەی دینمان، شتێك دابهێنێ کە لە دینەکەدا نەبێت، ئەوا ئەو شتە داهێنراوە قبوڵ نیەو ڕەد دەکرێتەوە)) متفق عليه.

٨- لەکاتی سەردانیکردنی لە قەبرەکەی و مزگەوتەکەی، نابێ دەنگ بەرز بکرێتەوەو ژاوەژاوو دەنگ بکرێت، بەڵکو دەبێ بە ئەدەب و ڕێزەوەو بە دەنگێکی نزم سەلامی لێ بکرێ. خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ... ﴿٢﴾ الحجرات... ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! ناشێ دەنگتان سەردەنگی پێغەمبەر کەوێ. دەنگیش هێندە بەرز مەکەن، وەك لەگەڵ یەکتردا داخێون؛ کە کارتان لێ پوچەڵ ببێ و خۆتان بەخۆتان نەزانن﴾.

# ئـەدەب و ئاکـــاری مســولمان لەگـــەڵ دایـك و بـــاوك

شاراوە نیە دایك و باوك بـۆ پێگەیانـدنی ڕۆڵـەکانیان و ئـەوخونی کـردن لـەپێناو بەرژەوەندیـەکانیان چـەندەها زەحمەت و ناخۆشی و موعانات دێتە ڕێگایان، هەروەها بـە تەنگ سۆزو خۆشەویستی ڕۆڵەکانیانـەوە دێـن، بەتایبـەت دایکـی بەسـۆز، کـە زەحمـەت و ئـازاری زۆر دەبینـێ بـۆ پەروەردەکردنی مندالەکانی، لەبەرانبـەر ئـەم موعاناتـەش تەنها خوای گەورە پاداشتی شایستەی خۆی دەداتەوە.

جا لە بەرانبەر چاکەکانی دایك و باوك پێویستە ڕۆڵەکان وەفـادارو بـە ئەمـەك بـن و، چـاکەکار بـن لەگەڵیانـدا و مافەکانیان نەفەوتێنن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ..پەروەردگارت فەرمانی دا، جگە لەو کەسی دی مەپەرستن، سەبارەت بـە دایك و بابیش چاکە بکەن.(٢٣) الإسراء﴾

﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ... ئێمـــه مرۆڤمـــان ڕاسپارد، لەگەڵ داك‌و بابی خۆی چاكه بكا ﴿٨﴾ العنكبوت﴾

چاكەكاری لەگەڵ دایك‌و باوك بـەگوێرەی ئـەم ئـاداب‌و ئاكارانەی خوارەوە دێتە دی:

١- گوێڕایەڵی كردنیان له چاكەدا: گوێڕایەڵی دایك‌و باوك لە خۆشەویستییەوە سەرچاوە دەگرێت، هیچ شتێك لای دایك‌و باوك ئەوەندە زەحمەت نیە، هێندەی سەرپێچی‌و گوێڕایەڵی نەكردنی ڕۆڵەكانیان، دیارە ئەمەش دەبێتـە ئـازاردانی دڵیـان‌و، ڕۆڵـەكانیان دەبنـە (عـاق) واتـە: ئازاردەری دڵی دایك‌و باوك، كە لە گوناهە گەورەكانە.

عن عبدالله عمرو بن العاص قال: قال رسول الله ﷺ: ((**الكبائر: الإشراك بالله، و عقوق الوالدين، وقتل النفس، واليمين الغموس** ... گوناهە گـەورەكان بـریتین لە: هاوبەش دانان بۆ خوا، ئازاردان‌و سەرپێچی دایـك‌و باوك، كوشتنی كەسێك بەناحەق، سوێندی بەدرۆ)) رواه البخاري.

لــەم فەرموودەیــەدا دوای هــاوەڵ بڕیــاردان بــۆ خــوا ئازاردانو سەرپێچی دایكو باوك بە گوناهە گــەورەکان دانراوە، بەڵام گوێڕایەڵیکردنی دایكو بــاوك دەبــێ لــە چاکەکاریدا بێت، نەك لە گونــاهو تــاوان، چــونکە ((لا **طاعة بشر في معصية الله، إنّما الطاعة في المعروف** ... لە سەرپێچیکردنی فەرمانــەکانی خــوا، نابــێ بــەگوێی هیچ کەسێ بکرێ، بەڵکو بەگوێکردن لە چــاکەکردنە)) رواه أحمد والبخاري ومسلم.

جا کاتێك دایكو بــاوك داوا لــە ڕۆڵــەکانیان دەکــەن هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بــدەن، یــان تاوانێــك بکــەن، نابــێ گوێڕایەڵییان بکەن، بەڵام دەبێ چاکەیان لەگەڵدا بکەن، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن جَـٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ...ئەگەریش هانیاندای شتێ بکــەی بەشەریکم کە خۆت هیچی لــێنازانی، فەرمانیان بەجێ مەهێنە، لە دنیادا بەخۆشی لەگەڵیانا بژی(١٥) لقمان﴾

ئەو چاکەکردنەی کە خوای گەورە لەم ئایەتـە باسـی دەکات دەبێ بەردەوام بێت‌و نابێ توندوتیـژیان لەگەڵدا بکرێ بە بەهانـەی ئـەوەی موشـریکن، بـەڵکو دەبـێ رۆڵەکان جەخت لەسەر مسوڵمانبونیان بکەن، ئەمـەش بە کـردەوەی جـوان‌و زمـان شـیرینی‌و نـەرم‌ونیانی لـە (صحیحین)دا هاتووە، لە عبداللّەی کوڕی مەسعودەوە کە گوتویەتی: سألت النبـي ﷺ أيُّ العمـل أحـبُّ الى الله تعالى، قال: **((الصلاة على وقتها، قلت ثُم أيٌّ؟ قال برّ الوالدين، قلت: ثُم أيٌّ؟ قال: الجهاد في سـبيل الله...** پرسـیارم لـە پێغەمبـەر کـرد، خـوا چ کردەوەیـەکی پێ‌خۆشە، ئەویش فەرموی: نوێـژکردن لـەکاتی خـۆی، گوتم: پاشان چی دی؟ فەرمووی: چـاکە نوانـدن لەگـەڵ دایک‌وباوك، گـوتم: پاشـان چـی دی؟ گـوتی: خـەبات‌و تێکۆشان لەپێناوی خوا)).

نابێ گوێڕایەڵییان بکـرێ لـە بەشـودانی بـەزۆرو ژن هێنانی بەزۆر، کە کچ‌و کوڕ پێی ڕازی نـین، یـان نابـێ بەقسەی ئەوان، پیاو خێزانەکەی تـەڵاق بـدات، ئـەوەتا

سەبارەت بەم مەسەلەیە پرسیار لە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) کرا، گەر باوکێک بە کوڕەکەی گوت هاوسەرەکەی تەڵاق بدات، ئیمام عومەر فەرمووی تەڵاقی نەدات، چونکە گوێڕایەڵی لە چاکەکاریدا دەبێت.

٢- نابێ بەرانبەر دایك‌و باوك نارەزایی‌و وەڕس بوون دەربڕێ، کە داوای شتێك لە ڕۆڵەکانیان دەکەن خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿...فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا...هەرگیز ئۆفیشیان پێ مەڵێ‌و تێیان مەخوڕەو بە زمانی خۆش بیان دوێنە (٢٣) الإسراء﴾

کەواتە لەکاتی داواکردنی هەر شتێکیان دەبێ بە زمانێکی شیرین‌و قسەی جوان وەڵامی داواکاریەکانیان بدرێتەوە، ئەمەش فەرمانی خوای گەورەیە، هەروەها لەکاتی داواکاریان وشەی (ئۆف) کە نیشانەی نارەزایی یە، لە بەرانبەریان نەکرێ ، نابێ ڕۆڵەکان دەنگیان بەسەر دایك‌و باوکیان بەرز بکەنەوەو نابێ بە سوک

سەیر بکرێن و بیروبۆچوونیان بەکەم بگیرێ، بەتایبەتی گەر دایك و باوك نەخوێندەوار بوون.

لە کاتی ڕوونکردنەوەی شتێکدا، یان ڕوونکردنەوەی دین، دەبێ بە شێوازێکی جوان و بە سۆزو میهرەبانی بۆیان ڕوون بکرێتەوە.

هەروەها دەبێ باڵی ملکەچی و سۆزیان بۆ ڕابخەین و دوعای خێریان بۆ بکەین، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ...بەبێ فیزی بیانخە ژێر باڵی بەزەیی و بڵێ: ئەی پەروەردگارم! وەکو ئەمان منیان بە شلکی پێگەیاند، تۆش وەبەر بەزەیی خۆتیانخە (٢٤) الإسراء﴾

دوعاکردن بۆیان لەدوای مردنیان سودیان پێدەگات و پلەیان لە بەهەشت بەرز دەکات وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((إن الله – عزّ وجلّ- ليَرفَع الدرجة للعبد الصالح في الجنّة فيقول: يارباً! أنّى لي هذه؟ فيقول؟باستغفار ولدك لك.. خوای گەورە لە بەهەشت

پلەی بەندەی چاك بەرز دەكاتەوە، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئەم پلەیەم لەكوێ بوو؟ ئەویش دەفەرموێ: بەهۆی داوای لێخۆشبونی كوڕەكەتە بۆتۆ)) رواه أحمد والطبراني في الأوسط ورجالهما رجال الصحيح عن أبي هريرة.

هەركەسێكیش لەكاتی زیندوویی دایكو باوكیدا نەیتوانی بێ چاكەیان لەگەڵدا بكات با لەدوای مردنیان چاكەیان لەگەڵدا بكات، ئەویش بە پاڕانەوە لە خوای گەورە كە لە گوناهیان خۆش بێت.

٣- لە ئادابی چاكەكردن لەگەڵ دایكو باوك ئەوەیە پەیمانو وەسیەتنامەو ڕاسپاردەیان جێبەجێ بكرێ، گەر تاوانو گوناهـ نەبوو، هەروەها ڕێزی هاوڕێكانیان لەدوای مردنیان بگیرێو سەردانیان بكرێ.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((إن أبرَّ البرّ صلة الولد أهل ودّ أبيه... باشترین چاكە ئەوەیە، كوڕ هاموشۆی برادەرو دۆستانی بكاتو ڕێزیان بگری)) رواه مسلم عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما .

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە عن مالك بن ربيعة الساعدي قال: ((بينما نحنُ جلوسٌ عند رسول الله ﷺ إذ جاء رجلٌ من بني سلمة فقال: يا رسول الله! هل بقي من برّ أبويّ شيء بعد موتهما؟ فقال: ((نعم الصلاة عليهما، والإستغفار لهما، وإنفاذ وعدهما من بعدهما، وصلة الرحم التي لا توصل إلاّ بهما، وإكرام صديقهما)) رواه أبو داود والحاكم في المستدرك (١٥٥/٤) وقال: صحيح على شرط الشيخين، ولم يخرجاه، وقال الذهبي: صحيح.

٤- دەبێ ڕۆڵەکان لەبەردەم دایكو باوکدا بەشێوەیەکی جوانو لایەقو ڕێك دابنیشنو، خۆیان دوورخەنەوە لە بێموبالاتی وەك قاچ درێژکردنو قاچ لەسەر قاچ دانانو دەست هەڵبڕین بەرامبەریان، نابێ لەبەردەم ئەواندا ڕۆڵەکان پاڵ بکەون، یان خۆیان ڕووت بکەنەوە، یان بە قاقا پێبکەنن، وە نابی لەکاتی ڕۆیشتن دا پێش باوك بکەونو نابێ لە پێش ئەو دابنیشنو نابێ بەناوی خۆیان بانگ بکرێن، وەك لە فەرموودەی

پێغه‌مبه‌ردا ﷺ هاتووه‌: ((عن أبـي هريـرة أن النبّـي ﷺ رأى رجلاً معه غلام، فقال للغلام: من هـذا؟ قـال أبي، قال: فلا تمش أمامه، ولا تستسب لـه، ولا تجلـس قبله، ولا ادعه باسمه)) رواه ابن الـسني وعبـدالرزاق في مـصنفه (١٣٨/١١) وقـال حبيـب الـرحمن الأعظمـي معلقاً: (والحيث أخرجه البخاري في الأدب المفرد).

٥- پێویسته له كاروبارياندا یارمه‌تیان بدرێ‌و شـتیان بـۆ هـه‌ڵبگیرێ، چـونكه زۆر ناشـیرینه‌و بێ‌ڕێزییـه، گـه‌ر له‌گه‌ڵ باوك به‌ڕێگادا بڕۆی‌و باوك شت هه‌ڵبگرێ‌و كوڕ به‌ده‌ست به‌تاڵی بـڕوات‌و هـیچ هه‌ڵنـه‌گرێ. هـه‌روه‌ها كچیش به‌هه‌مان شـێوه لـه ڕێـك‌و پێككردنـی مـاڵدا ده‌بێ یارمه‌تی دایكی بدات.

٦- ده‌بێ سومعه‌ی دایك‌و باوك بپـارێزرێ ئه‌مـه‌ش بـه‌وه دێتـه دی كـه ڕۆڵـه‌كان زیـان بـه خـه‌ڵك نه‌گه‌یـه‌نن‌و خراپه‌كار نه‌بن له‌گه‌ڵیاندا، تاوه‌كو خه‌ڵكیش به‌رپه‌رچی خراپه‌كاریـــه‌كانیان نه‌ده‌نــه‌وه بـــه جنێـــودان‌و دڵ بریندارکردن.

نابێ جنێو بە دایكو بـاوك بـدرێ، کـە لـە گوناهـە گەورەکانە، جنێودان بە دایكو باوك بەوە دەبێ کە تـۆ جنێو بە دایكو باوکی دژەکەت بدەیو ئەویش جنێو بە دایكو باوکی تۆ بداتـەوە، وەك پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرموێ: ((من الكبائر شتم الرجل والديه)) قالوا: يا رسول الله! وهل يشتم الرجل والديه؟ قال: ((نعـم يَـسُبُّ أبـا الرجـل فيَـسُبُّ أبـاه، وَيَـسُبُّ أمـه... لـە گوناهـە گەورەکان ئەوەیە، مرۆڤـ جنێو بە دایكو باوکی بدات، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! کەس هەیـە جنێـو بە دایكو باوکی بدات؟ فەرمووی: بـەڵێ، ئـەو کەسـە جنێو بە باوکی بەرامبەرەکەی دەدات، ئەویش جنێو بە باوکی ئـەو دەدات، هـەروا جنێـو بـە دایکـی دەدات، ئەویش جنێو بە دایکی دەدات، ئەویش جنێو بە دایکی ئەو دەدات)) متفق عليه.

تێبینی: لەگەڵ باسکردنی ئەدەب لەگـەڵ دایـكو باوکـان، هەندێ لە پاداشتی چـاکەکاری لەگـەڵ دایـكو بـاوكو هەندێ لە سزاکانی خراپەکارانیان دەکەین:

**یەکـــەم: پاداشـــتەکان:**

١- بە پلەی یەکەم دەبێ چاکە لەگەڵ دایك بکرێ، چـونکە بەهەشت لەژێر پێیەوە دەســت دەکـەوێ، روی الإمـام أحمد عن المقدام بن معد يكرب، عن النبي ﷺ قـال: **إن الله يُوصـــيكم بأمهـــاتِكم ... إن الله يُوصـــيكم بأمهاتِكُم ... إن الله يُوصـيكم بأمهـاتِكُم ... إن الله يُوصـــيكم بآبـــائِكُم ... إن الله يُوصـــيكم بـــالأقرب فالأقرب)** رواه ابن ماجه من حديث عبدالله بن عياش. عن جاهمة مرفوعاً: (ألزمها، فأن الجنّة تحت أقـدامها) رواه الإمام احمـد والنـسائي (صـحيح) صـحيح الجـامع (١٩٢٤) ورواه البخاري في الأدب والطبراني.

٢- دایكو باوك سەرچاوەی بەهەشتو دۆزخنو ڕەزامەندی خوای گەورە بــە ڕەزامەنـدی ئەوانــەوە بەســتراوەتەوە، وەك لە فەرموودەدا هاتووە: روى ابــن ماجـه عــن أبــي أمامة أن رجلاً قال: يـا رسـول الله! مـا حـق الوالـدين علـى ولـدهما؟ قـال: ((همـا جنّتـك ونـارُك)). وروى الترمذي عن ابن عمرو بـن عـاص: أن رسـول الله قـال:

**((رضا الرّب في رضا الوالد، وسخط الرّب في سخط الوالد))** ورواه ابن حبان ، انظر السلسلة الأحاديث الصحيحة رقم (٥١٦) ورواه الحاكم في مستدركه (١٥٢/٤) وقال: صحيح على شرط مسلم.

٣- لە دنیادا بەرەکەت دەکەوێتە تەمەنو وەچەو ڕزقەوە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: **((من سدّه أن يُمدّ له في عمره، ويزداد في رزقه، فَليبرّ والديه، وليصل رحمه))**. رواه أحمد عن أنس، وە دەفەرموێ: **((من بَرّ والديه طوبى له، زاد الله في عمره))** رواه أبويعلى والطبراني والحاكم (وقال: صحيح، وأقره الذهبي والأصبهاني عن معاذ بن أنس.

٤- چاکەکردن لەگەڵ دایك، دەبێتە مایەی سڕینەوەی گوناهو تاوان، (روى الترمذي عن ابن عمر أن رجلاً أتى النبّي فقال: يا رسول الله! إني أصبت ذنباً عظيماً، فهل لي من توبة؟ **((فقال: (هل لك من أم)؟ قال: لا، قال: (هل لك من خالة؟) قال: نعم، قال: فبّرها...** ئیبن عومەر گوتویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! گوناهێکی گەورەم

کردوە، ئایا بۆم هەیە تەوبە بکەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دایکت ماوە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: خوشکی دایکت ماوە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: کەواتە چاکە لەگەڵ ئەودا بکە)). رواه الحاكم بألفاظ متقاربة وقال: صحيح الإسناد.

**دووەم: سزاکان:**

١- ئازاردانی دڵی دایكو باوك لە گوناهە گەورەکانەو دەبێتە مایەی خەشمی خواو تەماشانەکردن بە چاوی رەحمەت لە رۆژی قیامەتدا، هەروا هۆیەکە بۆ نەچوونە بەهەشت لە (صحیح)ی بوخاریو موسلیم دا هاتووە عن أبي بكر قال: قال رسول الله ﷺ ((**ألا أنبئكم بأكبر الكبائر؟**)) قلنا: بلى يا رسول الله! قال: ((**الإشراك بالله وعقوق الوالدين**)) وكان متكئاً فجلس فقال: ((**ألا وقول الزور**)) فما زال يكررها حتى قلنا ليته سكت. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((**ثلاثةٌ لا ينظر إليهم يوم القيامة: العاقة لوالديه، والمرأة المترجلة، الديوث، وثلاثة لا يدخلون**

**الجنّة: العاق لوالديه والمدمن الخمر، والمنّان بما أعطى))** رواه النسائي عن عبدالله بن عمر.

٢- ئازاردەری دایكو باوك لە دنیادا تۆڵەو سزای لێدەسەنرێتەوەو بۆ ڕۆژی قیامەت دواناخرێ، وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: ((**كل الذنوب يؤخر الله ماشاء منها الى يوم القيامة إلاّ عقوق الوالدين، فإن الله يعجله لصاحبه في الحياة الدنيا قبل الممات...** خوا سزای هەموو گوناهێ، ئەوەی حەز بكات، بۆ ڕۆژی دوایی دوادەخات، تەنها ئازاردانی دایكو باوك نەبێت، خوا لەدنیا بەر لەمردنی بابای ئازاردەری دایكو باوك، سزای دەدات.)) رواه الحاكم والأصبهاني عن ابي بكرة.

كەواتە مسوڵمانی بەڕێز

زۆر ئاگاداربە، زۆر بترسێ، زۆر هۆشداربە نەكەی دڵی دایكو باوكت بڕەنجێنیو ئازاریان بدەیت، ئەگینا وەبەر هەڕەشەكان دەكەویو ڕەنجەڕۆ دەبیت، نوێژو ڕۆژەكانت دادت نادەنو چاكەكانت بەتاڵ دەبنەوە، لە دنیاش لەگەڵ دایكو باوكت چۆن ڕەفتار بكەیت، تۆش ئاوات لەگەڵ دەكرێتەوە.

# ئـەدەب و ئاكـاری مسـوڵمان لەگـەڵ خـزم و نزیكـانی

كاتێك ئیسلام هـات بایـەخێكی زۆری بـە خزمایـەتی و پتـەوكردنی پەیوەندیـەكانی نێـوان كەسـركاردا، هـانی مسوڵمانانیدا كە ئەم پەیوەندیە پـەرە پێبـدەن و تۆكمـەی بكەن. خوای گەورەش فەرمان بە مسوڵمانان دەكات، كـە خۆیان بپارێزن لە خۆدوورخستن و پـچڕاندنی پەیوەندیـەكان نێوان خزم و كەسوكار ئـەوەتا دەفـەرموێ: ﴿...وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ النساء ... ئیبن كثیر لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفـەرموێ: بـەواتای خۆتـان بپـارێزن لـە پـچڕاندنی خزمایـەتی و سـەردانی نەكردنیان، بـەڵكو دەبـێ چـاكەیان لەگـەڵدا بكـەن و ئـەم (صـلة)یە بەجێبهێنن﴾.

(قرطبـي) گوتويەتی: ميللەت هاودەنگن لەسەر ئـەوەی کە پەيوەندی خزمايەتی (صلة الـرحم) واجبـەو پـچڕاندنی حەرامە. ئەوەتا ئەسماء لە پێغەمبەری خوا پرسيار دەکات، کـە ئايـا سـەردانی دايکـی بکـاتو ئـەم (صـلة)يـە بەجێبهێنێ؟ پێغەمبـەريش ﷺ فـەرمووی: ((نعـم صِـلي أمك) رواه البخاري ومسلم وأبوداود وأحمد. جا پێغەمبـەر فەرمانی پێکرد کـە سـەردانی بکـات هەرچـەندە دايکـی ئافرەتێکی بێباوەڕ (کافر)ە.

دياره وشەی (الأرحام) کە لە قورئانـدا هـاتووه ناوێکـە بەکاردێت بۆ گشت خزمو کەسوکارو بەبێ جيـاوازی نێـوان مەحرەمو نامەحرەم. (تفسير القرطبـي).

## جۆرەکانی خزمو کەسوکار (صلة الرحم)

خزم دوو بەشی هەيە: گشتی و تايبەتی.

خزم بەگشتی: ئەوەيـە کـە لـە لايـەن دينـەوە يـەکتری دەگرنەوە لە مافەکاندا، کە پێويستە بەجێبهێنرێ ئـەيش بە خۆشەويستیو پشـتگيريکردينان ئامۆژگاری کردنيـانو

زیان پێنەگەیاندنیانو دادگەری کـردن لـە نێوانیانـداو بـە تیمـارکردنی نەخۆشـیەکانیانو مافـەکانی مـردو، وەکـو شوشتنیانو نوێژ لەسەر کردنیان دێتەدی.

بەڵام خزم بەتایبەتی: بریتییە لـە خزمایـەتی لەلایـەنی دایكو باوکیەوە، کە پێویستە مافـە تایبەتییـەکانیان بـە زیادەوەش جێبەجێ بکـرێ، وەکـو نەفەقـەدانو سـەردانی کردنیان بە مەبەستی لـە ئـەحواڵ پرسـینیانو فـەرامۆش نەکردنیان لە هیچ مافێکـدا، وەك لـە مافـە گـشتییەکان جەختی لەسەر کراوە.

دیارە چاکەکردنو سەردانی کردنی خزم بە پلـەی یەکـەم دایكو باوك دەگرێتەوە، ئنجا خوشكو برا، ئنجا بـە پێـی نزیکتر لە یەکتری، وەك لە فەموودەی پێغەمبەردا هاتووە:

**((عن أبـي هريـرة أن رجـلاً سـأل النبّـي يـا رسـول الله أيُّ الناس أحـق منّـي بحسن الـصحبة: فقـال رسـول الله ﷺ: أمّك، قال الرجل: ثُم من؟ قال: ثُم أمّـك، قـال: ثُـم مـن؟ قال: ثُم أمّك، قال: ثُم من؟ قال: ثُم أبـوك))** رواه البخـاري ومسلم وابن ماجه وأحمد وإبن حبان.

فقال رسول الله: **((أمّك وأباك، وأختك وأخاك، ثم الأقرب فالأقرب، ثم مولاك الذي يلي، ذاك حق واجب و رحم موصولة))** أخرجه البيهقي في السنن الكبرى ١٧٩/٤، وأبوداود في سننه (٥١٤٠).

لە چاکەکردن لەگەڵ خزمو کەسوکار ئەوەیە، گەر کەسێك ماڵوسامانی هەبوو، ویستی صەدەقەو خێر بکات پێویستە لە خزمەکانیەوە دەست پێبکات، ئەوەتا کاتێك ئەبوطەلحەی ئەنصاری دەیەوێ زەوییەکەی لەپێناوی خوای گەورە ببەخشێ، ئەویش دەیخاتە بەردەستی پێغەمبەر کە ئەو بیبەخشێتەوە، بەڵام پێغەمبەر پێی دەفەرموێ: **((وإني أرى أن تعطها في الأقربين))**، واتە: وادەبینم کە لەنێو خزمەکانتدا ببەخشیەوە. ئەبوطەلحەش گوتی: وادەکەم ئەی پێغەمبەری خوا، جا ئەبوطەلحە بەسەر خزمەکانیو کوڕە مامەکانی دابەش کرد، بوخاری ومسلم وأبوداودو دارمیو مالكو احمد گێڕاویەتیانەوە.

لە فەرموودەیەکی تردا هاتوە، کە صەدەقە کردن بە خزم دوو جۆرە: صەدەقەیەو گەیاندنی صیلەی رەحمە، عن

سلمان بن عامر عن النبّي قـال: ((الـصدقة علـى المـسكين صدقة، والصدقة على ذي الـرحم إثنتـان: صـدقة وصـلة)) اخرجـه أحمـد والترمـذي والنـسائي وابـن ماجـة والـدارمي والحاكم وصححه ووافقه الذهبـي.

تەنانەت گەر خـزم‌و کـەس‌وکار هاموشـۆیان نـەدەکردو چـاکەیان نـەبوو، خۆیـان دوور دەخـستەوە، پێویـستە مسوڵمانی مولتەزیم صیلەی رەحمی خۆی بـەجێ بهێنـێ‌و پاداشتی خوایی‌و پشتگیری خـوای گـەورەو پلەبـەرزی لـە قیامەت لەدەست نەدات. عن عمرو بـن شـعيب عـن أبيـه عن جده قال: ((جاء رجلٌ الى رسول الله فقال: يا رسول الله أفاكافئهم، فقال ﷺ: (لا) إذن تتركون جميعاً، ولكـن جُـد بالفضل، وصلهم فإنه لن يزال معـك ظهـير مـن الله -عـزّ وجّل- ومادمـت ذلـك)) رواه أحمـد (٢/٢٠٨،١٨١)، قـال الهيثمي: وفيه حجاج بن أرطأة وهـو مـدلس، وبقيـة رجالـه ثقات ﴿مجمع الزوائد (١٥٤/٨)﴾.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرموێ: عـن أبـي هريـرة عـن النبّـي قـال: ((مـن أراد أن يُـشرّف لـه بنيانـه ويُرفـع لـه

**الـدرجات يـوم القيامـة فليـصل مـن قطعـه، ولـيعط مـن حرمه، وليَعْف عمَّـن ظلمـه، ولـيَحْلُم عمَّـن جهـل عليـه))** تاريخ بغداد(٢١/٤) الكامل (١/١٠٠) لإبن عدي، عن برّ الوالدين لإبن الجوزي (٢٧١).

هـەروەها پاداشـتی صـەدەقەو خێـر بـە خزمێـك، کـە دژایەتیت دەکات نهێنی پاداشتەکەی لە خزمێکی‌تر باشترە وەك پێغەمبـەری خـوا دەفـەرموێ: **((إنَّ أفـضل الـصدقة الصدقة على ذي الرّحم الكاشح))** أخرجه أحمد (٤٠٢/٣)، والدارمي (١٦٧٩) عن حكيم بن حزام بسند حسن، أنظر صحيح الجامع (١١١٠)، وفي مجمع الزوائد (١١٦/٣) عـزاه لأحمد وللطبراني في الكبير وقال: إسناده حسن.

دیـارە چـاکەکردن لەگـەڵ خـزم‌و کـەس‌وکارو سـەردانی کردنیان دەبێتە مایەی بەرەکەت لە عومرو ماڵ‌و منـداڵ‌و رزق‌و ڕۆزی، وەك لە فەرموودەکانی پێغەمبـەردا هـاتووەو فەرمان دەکات ئەو کەسەی دەیەوێ حاڵی باش بێت‌و لەش ساغ‌و رزق زۆر بێت، کە ئەمە مانای بەرەکەت‌و زیادبوونی عـومرە، بـا چـاکە لەگـەڵ خـزم‌و کـەس‌وکاری بکـات‌و

سەردانیان بکات، وەك دەفەرموێ: **((مَن أحب أن يمد الله في عمره ويزيد في رزقه فليصل رحمه))** رواه البخاري ومسلم وأحمد عن أنس.

لە گێڕانەوەیەکی ئەبو هورەیرەدا دەفەرموێ: **((مَن أحب أن يبسط له في رزقه، ويُنسأ له في أثره: فليصل رحمه))** رواه البخاري (٥٩٨٥) وعنده في الأدب المفرد (٥٧) والبيهقي في شعب الايمان (٢١٨/٦).

خاتوو عائیشە دەفەرموێ پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: **((صلة الرحم و حُسن الخُلُق و حُسنُ الجوار يُعَمِّران الديار، ويزيدان في الأعمار))** أخرجه أحمد (٢٦٦/٦).

صیلەی رەحمیش گەر تەنها بە سەلام کردن بێت بەجێ دەگەیەنرێ، وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: **((صلوا أرحامكم ولو بالسلام))** حسن، القضاعي في الشهاب (٦٥٣-٦٥٤). أنظر الصحيحة للألباني (١٧٧٧).

بەڵام گەر مسوڵمان صیلەی رەحم بەجێنەهێنێ و لەگەڵ خزم و کەس و کاری چاکەکار نەبێ و سەردانیان نەکات، ئەوا خوای گەورە بەهەشتی لێ حەرام دەکات و ناچێتە

بەهەشتەوە، وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: **((لا يدخل الجنّة قاطع))** رواه البخاري ومسلم وأبوداود والترمذي وأحمد وابن حبان من جبير بن مطعم.

هەروەها دەفەرموێ: **((الرحم شجنة من الرحمن فمن قطعها حَرَّم عليه الجنّة))** رواه أحمد (١٩٠/١)، و بنحوه عند الحاكم (١٥٧/٤) عن سعيد بن زيد (الشجنة: عروق الشجر المتشابكة).

تەنانەت خوای گەورە كارو كردەوەی ئەو كەسانە قبوڵ ناكات كە صيلەی ڕەحم بەجێ ناهێنن، وە بەخششی خۆی بەسەرياندا ناباڕێنێ‌و بێبەشيان دەكات.

عن أبي هريرة أن رسول الله قال: **((إن أعمال بني آدم تُعرض كل خميس ليلة الجمعة، فلا يقبل قاطع الرحم))**. رجال ثقات كما في مجمع الزوائد(١٥١/٨)، وهو عند أحمد في مسنده (٤٨٤/٢).

وعن عبدالله أبي أوفى قال: قال رسول الله: **((إن الرحمة لا تنزل على قوم فيهم قاطع رحم))**. للبيهقي (٧٩٦٢). فانظر مجمع الزوائد (١٥١/٨).

لە کۆتاییدا بابزانرێ کە چاکەکردن لەگەڵ خزمو کەسوکار سەردانی کردنیان (دە) خەسڵەتی جوانی لــێ دێتەدی:

١- ڕەزامەندی خوای لــێ بەدەست دەهێنرێ، چونکە خوای گەورە فەرمانی بە صیلەی ڕەحم کردوە.

٢- خۆشیو شادیو دڵخۆشــیی دەکەوێتــە ناویانــەوە، لــە فەرموودەشدا هاتووە: (باشترین کردەوە، دڵخۆشکردنی بــڕواداره) ئەمــەش لــە (سلـسلة الـصحيحة للألبـاني (١٤٩٤)دا هاتووە.

٣- فریشتەکان پێی دڵخۆش دەبن.

٤- لەلایەن مسوڵمانانەوە ستایش دەکرێ.

٥- ئیبلیس خەفەتی پێدەخوات.

٦- بەرەکەت دەکەوێتە تەمەنیەوە.

٧- بەرەکەت دەکەوێتە رزقو ڕۆزییەوە.

٨- مردووەکانی پێی دڵخۆش دەبن، چونکە بابو باپیران بە صیلەی ڕەحم دڵخۆش دەبن.

٩- خۆشەویستی پێ زیاد دەبێت.

١٠- دوای مردنی پاداشتی زیاد دەبێ، چونکە کــە باســی دەکەن بەچاکە دوعا خێری بۆ دەکەن.

# ئــەدەبو ئاكــاری مســوڵمان لە مــیوانـــــداریدا

ڕێزگرتنــی میــوان لــەو فەرمانانەیــە، كــە پێغەمبــەری خواﷺ داكۆكی لــێ‌كردووەو، لەگەڵ ئیمان بــەخواو ڕۆژی دوایی جوت كردووە، وەك دەفــەرموێ: ((**مــن كــان یــؤمن بالله والیوم الآخر فلیكرم ضــیفة**... هەركەســێ بــڕوای بــە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕیزی میوانەكەی بگرێــت)). رواه البخاري (١٣/٨) ورواه مسلم (٧٥/٧٤).

میوانداریش چەند ئاداب‌و ئاكــارێكی هەیــە، پێویــستە بابای مسوڵمان پیادەی بكات:

١- پێویــــستیی‌و داواكاریــــەكانی میــــوان بەوپــــەڕی دڵخۆشییەوە بەجێ‌بهێنرێ.

٢- پێشوازی لە میوان بكرێ بە ڕوپەكی گــەش‌و خەنــدەوە بەخێرهاتنی بكرێ، هــەروەها لــە شــوێنێكی گونجــاوو لەبار دابنرێ‌و، شوێنی ئاودەســتی پیــشان بــدرێ، بــۆ نوستن‌و لەخەو هەڵسان كاتی دیاریكراو دابنرێ.

گەر ماڵ گونجاو نەبوو، ماڵەکە گچکەو تەسك بوو، ئەو کاتە دەکرێ لە ئوتێل ژووری بۆ تەرخان بکرێو بەکرێ بگیرێ.

بابای میوانیش نابێ لەدڵی خۆی بگرێ، کە لە ئوتێل ژوری بۆ گیراوە، چونکە هەموو کارێك بەپێی توانـاو گونجانە، ((لا یکلّف الله نفساً إلاّ وسعها)) نەك سەغڵەتیو زەحمەتیی، لە ئیسلامیشدا نابی مرۆڤ زیان نە بەخۆیو نە بە خەڵکی تر بگەیەنێ ((لا ضرر ولا ضرار)).

٣- بابای میوان گەر لە ماڵی هاورێکەی مایەوە، پێویستە لەگەڵ بابای میواندار کاتی دەرچونی دیاری بکاتو لەگەڵی لەماڵ بچێتە دەرەوە، دیاریکردنی کاتیش بۆ ئەوەیە، تا میواندار لەکاتی خۆی دوانەخرێ، هەروا کاتی هاتنەوە ماڵیش دیاری بکەن، نەبادا بابای میوان پێش میواندار بچێتەوە ماڵ.

٤- لە ئەدەبو ئاکاری مسوڵمان نیە، کە بابای میوان بەبێئیزنو مۆڵەتی خاوەن ماڵ لەماڵ دەربچێت،

شتێکی جوان نیە خاوەن ماڵ بچێتە ژوری میوان، کەچی بابای میوان بەبێ ئاگاداری ئەو دەرچوبێت.

٥- بابای میوان لە سێ رۆژ زیاتر نەمێنێتەوە، نەبادا ببێتە مایەی بارگرانیو لەکارکردنی خاوەن ماڵ. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((**الضيافة ثلاثة أيام فما زاد فصدقة...** میوانداری سێ ڕۆژە، گەر لەوە زیاتر بێت ئەوە خێرە)) متفق عليه، مەگەر خاوەن ماڵ سور بێت لەسەر زیاتر مانەوەی میوان.

٦- نابێ خاوەن ماڵ، ئیش بە میوان بکات، چونکە دەبێتە مایەی زەحمەتو ناخۆشیی بۆ میوان، هەروا ئەمە ڕێزو ئەدەب نیە بەرانبەر بە میوان، هەروا کارێکی ناجوامێرانەیە.

٧- لە ئەدەبو ڕێزگرتنی میوان ئەوەیە، کە بەو شێوازە قسەی لەگەڵ بکرێ، کە دڵی پێ خۆش ببێت، هەروا خۆشحاڵی بەهاتنی دەربڕێو لە حاڵو ئەحواڵیو کەسوکاری پرسیار بکرێ، هەروا لەبەردەمی میوان نابێ باسی دەستکورتیو نەداری بکرێ، یان لەبەردەمی

ئەودا نابێ خۆ لە منداڵ تووڕە بکرێ، یان لە منداڵ بدرێ، نەبادا بە گومانی خۆش نەهاتنی ئەو لێك بداتەوە.

٨- ڕێزگرتنی میوان لەلایەن خواردنەوە، بە پێی دارایی و هەبوویی یە، نابێ لەتوانا بەدەر خواردنی بۆ ئامادە بکرێ، کە خاوەن ماڵ لە. ەری قەرزار ببێتەوە، چونکە ئەسڵی مەبەست ڕوخۆشی و گوفتار جوانیە، لە ئیمامی ئەوزاعی یان پرسی: ڕێزگرتنی میوان چیە؟ ئەویش گوتی: ڕوخۆشی و قسەخۆشیی. بەڵام گەر خاوەن ماڵ دارا بوو، با خواردنی باش بۆ میوان ئامادە بکات بەبێ زیادەڕۆیی کردن.

٩- لەکاتی نان خواردن، نابێ خاوەن ماڵ، پێش میوان دەست لەنان خواردن هەڵبگرێ، چونکە میوانەکە شەرم دایدەگرێ و ئەویش دەست هەڵدەگرێ، کە هێشتا تێر نەبووە، گەر خاوەن ماڵ زوو تێر بوو، با خۆی بە کەوچکەکەیەوە بخافڵێنێ، کە میوانەکە هەست بکات، ئەو بەردەوامە لە نان خواردن.

هەروەها دەبێ خاوەن ماڵ ئاگاداری میوان بێ، خواردنی بۆ تێبکات، نەبادا ئەو کەسە شەرم بکات، وەك لە فەرمودەی پێغەمبەرﷺ دا هاتووە، کە ئیبن عومەر گوتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: **((إذا وضعت المائدة فلا يقوم رجلٌ حتى ترفع المائدة، ولايرفع يده وإن شبع حتى يفرغ القوم، وليعذر فإن الرجل يُخجلُ جليسه، فيقبض يده، وعسى أن يكون له في الطعام حاجة))** سنن ابن ماجه، ج٢، ص١٠٩٦.

واتە: گەر سفرەی نان ڕاخرا، با هیچ کەسێك هەڵنەستێ، هەتا سفرەکە هەڵدەگرن، با دەست لە نان هەڵنەگرێ، ئەگەر چی تێریش بوبێ، هەتا میوانەکان لە خواردن دەبنەوە، با لە خواردنەکە کەمێك زیاتر بخوات، چونکە بە دەست هەڵگرتنی ئەو کەسەی لە تەنیشتی دانیشتووە بە شەرم دادەخاتو ئەویش دەست دەکێشتەوە، کە ڕەنگە هێشتا ماویەتی تێر ببێ.

١٠- پێش نان خواردنو لە کاتی نان خواردن باسی شتی وانەکرێ، کە میوان پێی ناخۆشەو بێزی لێ دەبێتەوەو

ئارەزوی پـێدەگیرێ، وەك بـاس نـەکردنی (نەخۆشـی، ڕشانەوە، مشك و جورج و...هتد).

١١- هـەروەها لـە ریزگرتنـی میـوان ئەوەیـە، کـە بـە خۆشحاڵیەوەو بە گوتـەی شـیرین بـەڕێ بکـرێ و داوای گەردن ئازایی لـێبکرێ لە هەبوونی کەمتەرخەمیی.

## ئـــەدەب و ئاکاری مســـوڵمان لــە بەکارهێنانی تەلــەفۆن و مۆبایل دا

گوێچکە بەخششێکی هەستیارو گرنگـە، کـە خـوا بـە بەنـدەی خـۆی بەخـشیوە، ئـەم دەزگایـەش دەبـێ لـە گوێبیستنی شتی خراپ و نابەجێی بپارێزین و، نەهێڵین بـە بیستنی قسەی ناشیرین و نابەجێ و حەرام، ببێتە شـایەت و بەڵگە لەسەرمان لە ڕۆژی دواییدا.

دیارە تەلەفۆن و مۆبایل لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بۆتـەی پێویـستییەکی بەڵگەنەویـست، کـە دەبـێ بەشـێوەیەکی دروست و بەجێ بەکاربهێنرێ، کە کاریگەری خراپی لەسـەر کۆمەڵگە نەبێت.

جا هەندێ ئاداب و ئاکارو ڕەوشت هەیە بۆ بەکارهێنانی تەلـەفۆن و مۆبایـل، کـە پێویـستە مرۆڤـی مـسوڵمانی ڕاســتەقینە پابەنـدی بێـت و جێبـەجێی بکـات، کـە ئەمانەن:

١- كــه تەلــەفۆن دەكــەی، دەڵــێی: ﴿ئــەلو...الــسلام علیكم...من (فلانم)﴾، ئنجا چاك‌و چۆنی دەكەیت.

٢- ڕەچاوكردنی بارودۆخی ئەو كەسانەی كـە پەیوەنـدیان پێوە دەكەیت، نابێ لەكاتی نوستن‌و كـاتی كـاركردن‌و وەك كاتی بەیانییەكی زوو، یـان لـە شـەوی درەنـگ وەخت، یان كاتێك كە دەزانی وەختەكە وەختی نوێژە، تەلەفۆن بكەیت.

٣- لەكاتی تەلەفۆن كردنـدا، درێـژە بـە قـسە نـەدەیت‌و تەلەفۆنەكە مەشغول نەكـەیت، لەوانەیـە خـەڵكانێك هەبن، بیانەوێ پەیوەندیت پێوە بكـەن، یـان بیانــەوێ پەیوەندی بەو كەسـانەوە بكـەن، كـە تەلـەفۆنیان بـۆ دەكەیت...

٤- بۆ حاڵــەتی پێویـست نـەبێ تەلـەفۆن نەكـەیت، وەك سـەردانی نەخۆشـێك، یـان خێروچـاكەیەك، یـان قسەیەكی گرنگ، هەروا تەلەفۆن نەكەیتە ئـامێرێكی گاڵتەو سوعبەت، یان هەراسان كردنی خەڵك...

٥- لەکاتێك لە ئاودەستی، وەڵامی مۆبایل مەدەوە، چونکە شوێنێکە شیاوی قسەکردن نیە...

٦- بۆ پێویستی نەبێت لە شوێنە گشتیەکان وەك ناو پاس‌و ریم‌و ئۆتۆمبیل‌و ڕێگاو قوتابخانەو نەخۆشخانەکان، مۆبایل بەکارمەهێنە.

٧- ئەو مۆبایلانەی کامیرایان تێدایە، نابێ بەبێ مۆڵەتی هیچ کەسێ وێنە بگیرێ، نابێ وێنەی ئافرەتان بگیرێ، کە دوایی وەك هەڕەشە بەرانبەر بە کەسانیان بەکاریان دێنن، هەرچەندە ئەمە لە ڕەوشتی موسڵمانی پابەند بە دینی خوا ناوەشێتەوە..

٨- لەسەر دایك‌و باوکانی هۆشیار بەدینی خوا، کوڕو کچانیان لەم ئامێرە ئاگادار بکەن‌و لایەنە خراپ‌و باشەکانیان بۆ ڕون بکەنەوەو ڕێنماییان بکەن، کە بۆ چ شتێ بەکاری بهێنن‌و بۆ چ شتێ بەکاری نەهێنن.

# ئـــەدەبو ئاکاری مســوڵمان
# لــەکـــاتی نـــان خــــواردن

لە کاتی نان خـواردن چـەند ڕەفتارێـك هەیـە ئیـسلام دایناوە، کە پێویستە بە مندالّو گەورەوە پیادەی بکەن:

**أ- شوشتنی دەســتەکان پێش نان خواردن:**

وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویـەتی ((**برکـة الطعـام الوضوء قَبْلَهُ والوضوء بَعْدَه**: بەرەکەتی خواردن لەوەدایـە، کە لە پێش نـان خـواردن دەسـت بـشۆری‌و لـە دوای نـان خواردنیش))[١].

هەروەها ئەنەس دەڵێ: گوێم لە پێغەمبـەری خـوا بـوو ﷺ دەیفەرمو: ((**مَنْ أحبَّ أن یکثر الله خیر بیتهِ فلیتوضأ إذا حَضَر غِذاؤه واذا رَفَع**: هەر کەسێك پێی خۆشـە خێـرو بێری ماڵەکەی زۆر بێ با دەسـتنوێژ هـەڵگرێ (مەبەسـتی

١) رواه ابو داود والترمذي عن سلمان الفارسي.

دەست شوشتنە) گەر خواردنەکەی بۆ ئامــادەکراو، وە کــە هەڵگیراش))[١].

**ب- نــاوی خوا هێنان لەکاتی دەست کردن بە خواردن.**

ئەمەش وەك پێغەمبەر فەرمانی کــردووە، کــە خــاتوو عــائیشە -ڕەزای خوای لـــێبێ- گوتویــەتی: پێغەمبــەری خواﷺ فەرمویەتی: ((**إذا أكـل أحـدكم فليـذكر اسـم الله تعالى. فإن نسي أنْ يذكر اسم الله تعـالى في أولـه فليقـل: باسم الله أوله وآخـره**: ئەگــەر یــەکێك لــە ئێــوە خــواردنی خوارد، با ناوی خوا بــێنیو بڵــێ: (بــسم الله)، ئەگــەر لــە سەرەتاوە لە بیری چوو ناوی خوا بێنێ، بــا بڵــێ (بــسم الله أولــە وآخــره) واتــە: بــەناوی خــوا لــە ســەرەتای خــواردنو کۆتاییەکەی))[٢].

ئیمام ئەحمەدو غەیری ئەویش دەگێڕنــەوە: ((**أن النبــي ﷺ إذا أكل أو شرب قال: الحمدلله الـذي أطعمنـا وسـقانا وجعلنا مـسلمين**: گەر پێغەمبەر خواردنێکی بخواردایە، یان

---

١) رواه ابن ماجه والبيهقي.
٢) رواه ابو داود والترمذي.

شلەیەکی خواردبوایە، دەیفەرمو: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خواردن‌و خواردنەوەی پێ بەخشین‌و ئێمەی کرد بە مسوڵمان)).

## ج- کە خواردنێکی بۆ هاتە بەردەم ڕەخنەی لێ نەگرێ:

ئەوەشیان سیفەتی پێغەمبەری ئازیزمانە، وەك بوخاری‌و موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە گوتویەتی: ((**ما عاب رسول الله ﷺ طعاماً قطُّ: إن اشتهاه أكله، وإنْ كَرَهَهُ تركه**: پێغەمبەری خوا هەرگیز عەیب‌و ڕەخنەی لە خواردن نەگرتووە، گەر حەزی لێ بوایە ئەیخوارد گەر حەزی لێ نەبوایە نەیئەخوارد، وازی لێ نەهێنا)).

ئەم سیفەتە بەرزەی پێغەمبەر ﷺ، هەست ڕاگرتن‌و پێزانینێتی بەرامبەر بەو کەسەی خواردنی بۆ ئامادە دەکات، تا تەریق نەبێتەوەو، لە چێشت ئامادەکردن سارد نەبێتەوە.

**د- بەدەستی ڕاستو لەبەردەمی خۆدا خواردن بخوریّ:**

ئەمەش وەك موسلیم لە عومەری كوڕی ئەبی سەلمە ڕەزای خوایان لیّ بیّ دەگێڕێتەوە، عومەر دەڵیّ: (**كُنْتُ غُلاماً في حِجْرِ رسول الله ﷺ وكانت يدي تطيش في الصَّفْحةِ فقال لي رسول الله ﷺ "يا غلام سَمِّ الله وكُلْ بيمينك و كُلْ مما يليك**: منداڵ بووم لە ژێر سەرپەرشتیو چاودێری پێغەمبەری خوا، لە كاتی نان خواردن دەستم بەم لاو ئەم لای قاپەكە دەگێڕا، پێغەمبەری خوا پیّ گوتم: ((ڕۆڵە! لە كاتی نان خواردن ناوی خوا بێنە، واتە بڵیّ (بسم الله)و بە دەستی ڕاستت بخۆو لە پێش خۆتەوە بخۆ)).

**ه- بە پاڵ كەوتنەوە خواردن نەخوریّ:**

ئەمەش لەبەر ئەوەی زیانی تەندروستی هەیەو نیشانەیەكی لووت بەرزیو فیزیە. پێغەمبەریش ﷺ، كە بوخاری لە ئەبی جحیفەی وەهەبی كوڕی عبدالله دەگێڕێتەوە، فەرمویەتی: ((**لا آكل متكئاً**: بە پاڵ كەوتنەوە خواردن ناخۆم)). موسلیم لە ئەنەسەوە

دەگێڕتەوە، کە وتویەتی: ((رأيت رسول الله ﷺ جالساً مقيعاً ياكل تَمراً: پێغەمبەری خوام بینیوە بە دانیشتنەوە خورمای دەخوارد.))

**و- لە کاتی نان خواردن واباشە قسە بکرێ:**

موسلیم لە جابرەوە رەزای خوای لێبێ دەگێڕێتەوە: ((أن النبّي ﷺ سأل أهله الأُدُمَ، فقالوا: ما عندنا إلاّ خَلّ، فدعا به فجعل ياكل منه ويقول : نِعْمَ الأُدُمُ الخل، نِعْمَ الادُمُ الخلّ: پێغەمبەری خوا داوای لە خێزانەکەی کرد، کە پێخوری بۆ بێنێ، وتیان تەنها سرکەمان هەیە، جا داوای سرکەی کرد بۆی بێنن. کە هێنایان دەستی کرد بە خواردنیو دەیفەرمو: باشترین پێخور سرکەیە، باشترین پێخور سرکەیە).

بەڵام کە قسەدەکرێ، ئەوکەسەی خواردنی لەدەم دایە، با خواردنەکەی قوت بدات، ئنجا قسە بکات، یان کە خواردنی لەدەم دایەو قسە دەکات، با دەست بە دەمیەوە بگرێ، تا خواردنی ناو دەم بەدەر نەکەوێ، چونکە

بەدەرکەوتنی خواردنی ناو دەم، دەبێتە هۆی بێزبونەوەو قێزکردنەوەی بەرامبەرەکەی، هەروەها نەهێڵێ خواردن بە لێوو دەمیەوە بنوسێ، پێویستە دەستەسڕ (کلینکس) بەکاربێنێ بۆ خاوێن کردنەوەی لێوو دەمی لەکاتی نان خواردندا.

**ز- گەر میوانی یەکێك بووی، وا باشە دوای تەواوبوون لە نان خواردن دوعا بۆ خاوەن ماڵەکە بکەیت:**

ئەبو داودو ترمذی لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە: ((أن النبيّ ﷺ جاء الى سعد ابن عبادة، فجاء بخُبْزٍ و زيتٍ فاكَلَ، ثم قال النبيّ ﷺ: أفْطَرَ عنْدكُمُ الصَّائمون، واكل طعامكم الابرار، وصلّتْ عليكم الملائكة ... پێغەمبەر چوو بۆ لای سەعدی کوڕی عوبادە، جا نانو ڕۆنی زەیتو (ئەحمەدو تەبەرانی دەڵێن مێوژیان) بۆ هێنا، پێغەمبەر نانو مێوژەکەی خواردو، پاشان دوعای بۆکردن فەرموی: ڕۆژوەوان لە لاتان ڕۆژو بشکێنێ، پیاوی چاك خواردنتان بخوات، فریشتەکانیش ڕەحمەتتان بەسەردا بیارێنن)).

## ح- گەر یەکێك لە خۆی گەورەتری لەگەڵ بوو، یەکسەر ئەو دەست بە نان خواردن نەکات:

وەك موسلیم لە کتێبی (صـحیح)ی دا لـە حوزەیفـەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((**کُنَّا إذا حـضرنا مـع رسـول الله ﷺ طعاما لم نَضَعْ ایدینا حتی یبدأ رسول الله ﷺ فیضع یده**: گەر لەگەڵ پێغەمبەری خوا ئامادەی خواردنێـك بووبـاین، هیچ کامێکمان دەسـتمان بـە نـان خـواردن نـەدەکرد، تـا پێغەمبەری خوا دەستی بە نان خواردن نەکردبایە)).

کەواتە لە ماڵێش، کە خێـزان بەیەکـەوە نـان دەخـۆن، هەتا باوك کە سەرۆکی خێزانە، دەست بە خواردن نـەکات، با مندالەکان پێش ئەو، دەست بـە نـان خـواردن نەکـەن، کەواتە دەبێ منداڵان وا ڕابهێنرێن پێش باوکیان دەست بە نان خواردن نەکەن.

## ع- نیعمەتی خوا، بە تایبەتی خواردن بە کەم دانەنرێ:

وەك موسلیم لە ئەنەسەوە دەگێڕێتـەوەو دەڵـێ: ((**کـان رسول الله ﷺ اذا اکل طعاماً لَعِقَ اصابِعَهُ الثلاث وقال اذا سقطت لقمة احدکم فلْیأخذها وَلْیُمِطْ عنها الأذی ولیاکلها**

**ولا يدعها للشيطان. وامرنا ان نَسْلتَ القِصعة، وقال (إنَّكُم لاتدرون في أي طعامكم البركة**: گەر پێغەمبەری خوا خواردنی بخواردایە، هەر سێ پەنجەکانی دەلێسیەوە، جا فەرمویەتی: ئەگەر پاروویەك نان لە دەستان کەوتە سەر زەوی، با هەڵی گرێتەوەو ئەو پیسیەی، کە پێوەی دەنووسێ پاکی بکاتەوەو بیخوات، با بۆ شەیتانی بەجێ نەهێڵێ. هەروا پێغەمبەر فەرمانی پێکردووین، کە قاپی خواردنەکە هیچی تیا نەهێڵین‌و هەمووی بخۆین، فەرمویەتی: ئێوە نازانن لە چ خواردنێکدا بەرەکەتی تێدایە).

  

## ئــەدەبو ئاکاری مســوڵمان
## لە کاتی خـــواردنەوەدا

أ- لەکاتی ئاو خواردنەوە یان هەر شــلەیەکی تــر نــاوی خوا بهێنرێ، کە خواردراوەش، سوپاسی خوا بکرێو، بە سێ جار بخورێتەوە:

وەك ترمــذی لــە ئــیبن عــەبباس، ڕەزای خــوای لێبــێ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((لا تشربوا واحدا كَشُربِ البعير. ولكن اِشرَبوا مَثنــى وثــلاث، وَسَمُّوا إذا انتم شَرِبتم، واحمدوا اذا رفعتم ... وەك حوشــتر بە یەکجار ئاو، یان هەر شلەیەکی تر مەخۆنەوە. بەڵکو بە دووجار، یان سێجار بیخۆنەوەو ســێجار خواردنەوەکــەش، دەبێ لە نێوانیان لــە دەرەوەی جــامو پەرداخــەوە هەناســە بــدەیت وەك پێغەمبــەر ﷺ ئــاوای کــردووە، ئەنــەس وتویەتی: ((أن رسول الله كــان يتــنفس في الــشراب ثلاثــاً)) رواه احمد (٣/٢١١). لــە کــاتی خواردنەوەیــدا نــاوی خــوا

بێنن، واتە بڵێن: (بسم الله)، کە خواردیشتانەوە سوپاسی خوا بکەن و بڵێن (الحمدلله).)).

**فوو نەکردن لە ئاو خواردنەوە:**

لەکاتی ئاو خواردنەوە، نابێ فو لە ئاوەکە بکرێت (ئەبو سەعید گوتویەتی: پێغەمبەری ﷺ خوا: ((**نهى عن النفخ في الشراب**... قەدەغەی کردووە فو لە خواردنەوە بکرێت))رواه الترمذي (١٨٨٧)وصححه.

**ب- پڕ نەکردنی گەدە لە خواردن و خواردنەوە:**

وەك ئیمام ئەحمەدو ترمذی و غەیری ئەوانیش دەگێڕنەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، کە فەرمویەتی: ((**ما ملأ آدمي وعاء شَراً منْ بَطنِه، بِحَسب ابْن آدمَ لُقَيمات يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فإنْ كانَ لابُد فاعلاً، فَثُلُث لِطعامِهِ و ثُلُثٌ لِشرابِهِ، وَثُلُثٌ لِنَفسِهِ** ... ئادەمیزاد هیچ کیسەیەکی لە سکی خراپتر پڕ نەکردووە، بۆ ئادەمیزاد بەسە چەند پاروویەك بخوات، تا پشتی پێ رابگیرێ، گەر ئاواشی نەکرد، با سکی بکات بە سێ بەشەوە، سێیەکی بۆ

خواردن و، سێیەکی بۆ خواردنەوەو، سێیەکی تری بۆ هەناسە)).

**ج- خواردن و خواردنەوە بە ڕۆیشتن و دانیشتنەوە:**

یەکێ لە ئاداب و ئاکاری خواردن و خواردنەوە ئەوەیە، دەکرێ بەڕۆیشتنەوەو بە ڕاوەستان و بە دانیشتن خواردن بخورێ و خواردنەوە بخورێتەوە. ﴿ئەوەتا (ابن عمر) گوتویەتی: (**كنّا على عهد رسول الله ﷺ نأكل ونحن نمشي**.. لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بە ڕۆیشتنەوە خواردنمان دەخوارد﴾ سنن ابن ماجە ٢، ص١٠٩، جا گەر بە ڕۆیشتنەوە جائیز بێت، ئەوا بە ڕاوەستانەوە لە پێشترو دروستترە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاوەستانەوە ئاوی خواردۆتەوە وەك ئیبن عەبباس گوتویەتی: ((**أتين النبي بدلو من ماء زمزم فشرب وهو قائم**... دەولکەیەك ئاوی زەمزەمم بۆ پێغەمبەر هێنا، ئەویش بە ڕاوەستانەوە خواردیەوە)) متفق عليه .

هەروەها ئیمام عەلی کە ئاویان بۆ هێناوە، دەستو دەمو چاو شوشتوە، ئنجا بە ڕاوەستانەوە بەرماوەی ئاوەکەی خواردۆتەوەو، پاشان گوتویەتی: خەڵکانێك هەن پێیان ناخۆشە بە ڕاوەستانەوە ئاو بخورێتەوە، بەڵام پێغەمبەر ئاوای خواردۆتەوە (بە ڕاوەستانەوە، وەك من بە ڕاوەستانەوە خواردمەوە).

عن علي ﷺ (إنه صلى الظهر ثم قعد في حوائج الناس في رحبة الكوفة حتى غسل وجهه ويديه، وذكر رأسه و رجليه، ثم قام فشرب فضله وهو قائم، ثم قال: إن ناساً يكرهون الشرب قائماً، وإن النبّي صنع مثل ما صنعت) أخرجه البخاري في الصحيح ٨١/١٠)[1].

---

١) مصابيح السنة للإمام البغوي، المجلد الثالث، ص١٧٥.

# ئـەدەب و ئاکـاری مسـوڵمان
# لە سـڵاوکـردندا

سڵاوکردن چەند یاساو ئادابێکی هەیە، کە دەبێ بزانرێ:

**أ/ خوای گەورە فەرمانی کردوە بە سڵاو لەیەکتری کردن:**

وەك دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَا... ﴿٢٧﴾ النور ... مەچنە ناو خانووێك (ماڵێك)، کە هی خۆتان نیە، تا ڕێگەتان پێ نەدرێ و سڵاو لە ئەهلی ئەو ماڵە دەکەن﴾

هەروەها دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا دَخَلۡتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ تَحِيَّةً مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً ... ﴿٦١﴾ النور ...گەر چوونە هەر ماڵێك سڵاوی خوا لەسەر خۆتان بکەن، کە پیرۆزو پاك و باشە﴾.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی، کە موسلیم لە ئەبوهورەیرە دەگێڕێتەوە: ((**لا تدخلوا الجنّة حتى تؤمنوا ولا تؤمنوا حتى تحابوا أولا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم؟ أفشوا السلام بينكم**... تا باوەڕنەهێنن ناچنە بەهەشت، ئیمانیشتان تەواو نابێ، تا یەکتریتان خۆش نەوێ. ئایا شتێکتان پێ بڵێم گەر بیکەن یەکتریتان خۆش بوێ؟ سڵاو لە یەکتری بکەن)).

**ب/ چۆنیەتی سڵاوکردن لەیەکتری:**

پێویستە خۆمان و ماڵ و منداڵمان بەمجۆرە سڵاو بکەین، کە ئیسلام بۆی دایناوین، ئەویش بەم شێوەیە: ئەوەی کە سڵاو دەکات دەڵێ: (**السلام عليكم ورحمة الله وبركاته**) بەرامبەرەکەشی لەوەڵامدا دەڵێ: (**عليكم السلام ورحمة الله وبركاته**) ئەمەش بە گوێرەی فەرمودە صەحیحەکانی پێغەمبەرە وەك ئەبو داود و ترمذی دەگێڕنەوە. لە عومرانی کوڕی حصین ڕەزای خوایان لێبێ دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: السلام عليكم، پێغەمبەر وەڵامی

دایەوەو پاشان پیاوەکە دانیشت‌و پێغەمبەر فەرموی((دە))
واتە (دە) چاکەی بۆ نووسرا، پاشان پیاوێکی‌تر هاتە لای
گوتی: السلام علیکم ورحمة الله، وەڵامی سڵاوەکەی
دایەوەو پاشان دانیشت، پێغەمبەر فەرموی ((بیست))
واتە: بیست چاکەی بۆ نووسرا. پاشان پیاوێکی تر هاتە
لای گوتی: (السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته) جا وەڵامی
سڵاوەکەی درایەوەو پاشان دانیشت، پێغەمبەر فەرموی:
((سی)) واتە سی چاکەی بۆ نووسرا.

هەروەها بوخاری‌و موسلیم لە خاتوو عائیشە رەزای
خوای لێبێ دەگێڕنەوە، کە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا
پێی گوتم (ئەمە جبریلە سڵاوت لێ‌دەکات)، ئەویش
وەڵامی داوەتەوەو فەرمویەتی (وعلیه السلام ورحمة الله
وبرکاته).

## ج- یاساو ئاکاری سڵاوکردن:

ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری
خوا ﷺ فەرمویەتی: ((يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ على الماشي، والماشي

**على القاعِد، والقليل على الكثير** ...سواریی سڵاو لە پیادە دەكات، ئەوەی دەڕوات سڵاو لەو كەسە دەكات، كە دانیشتووە، كۆمەڵێكی كەم سڵاو لە كۆمەڵێكی زۆر دەكەن)[١].

لە گێڕانەوەیەكی بوخاریدا دەڵێ: ((**يُسَلِّم الصَغير على الكبير** ...منداڵ سڵاو لە گەورە دەكات)).

ئەم ڕێنموویی‌و تەوجیهاتە پیرۆزە، پێویستە خۆمان بە گشتی‌و منالەكانمان بە تایبەتی پیادەی بكەین، چونكە سڵاوكردن سیفەتێكی دیارو جیاكەرەوەی ئوممەتی ئیسلامیە لە كۆمەڵانی تر.

**د- پەروەردیارو مامۆستا پێویستە سڵاو لە منداڵ بكات:**

وەك پێغەمبەرﷺ ئەم ڕەفتارە جوانەی كردووە، وەك بوخاری‌و موسلیم لە ئەنەس ڕەزای خوای لێبێ دەگێڕنەوە: ((**أنه مرَّ على الصِبيان فَسَلَّمَ عليهم وقال كان**

---

١) بوخاری‌و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

**النبيّ ﷺ يَفعَلُهُ**: ئەنەس بە لای چەند منداڵێکدا تێپەڕ بووەو سڵاوی لێکردوون، جا گوتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئاوا سڵاوی لە منداڵان کردووە)). لە گێڕانەوەیەکی موسلیم دا هاتووە: ((**أن رسول الله ﷺ مَرَّ على غِلْمان فَسَلَّم عليهم** ... پێغەمبەر ﷺ بە لای چەند کوڕیژگەیەکدا ڕۆیشتووەو سڵاوی لێکردوون))، هەروەها لە گێڕانەوەیەکی ئەبو داوددا هاتووە: ((**أن النبّي ﷺ مرَّ على غِلْمان يَلْعَبون فَسَلَّم عليهم**))، لە گێڕانەوەی (ابن السنی)دا پێغەمبەر بە منداڵانی فەرموە: ((**السلام عليكم ياصبيان**... کوڕەکان! سڵاوتان لێبێ)).

لە ڕاستیدا ئەمەیە ڕەوشت و ڕەفتار بەرزی مسوڵمان و خۆ بە زڵ نەزان، جا گەر ئێمەش خۆمان بە شوێنکەوتەی پێغەمبەر دەزانین، با پیادەی ئەم ئایەتە پیرۆزە بکەین ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ الأحزاب ... لە پێغەمبەری خوا پێشەنگی زۆر جوان بۆ ئێوە هەیە﴾.

**هـ- وەڵامدانەوەی سڵاوی نامسوڵمان بە (وعلیکم):**

ئەنەس دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((إذا سَلَّمَ عَلَيكم أهل الكتاب فَقولوا: وَعَليكُمْ ...گەر مەسیحیو جوولەکە سڵاویان لێ کردن، ئێوە بڵێن: (وَعَليكُمْ) واتە: لە ئێوەش))[1]. هەروەها نابێ سەرەتا مسوڵمان سـڵاویان لێ بکات، وەك لە حەدیسی موسـلیمدا هـاتووە: ((لا تَبْدَؤوا اليهود والنصارى بالسلام... ئێوە دەستپێشخەری مەکـەن لە سڵاوکردن لە جوولەکەو دیانان)).

**و- سڵاوکردن سوننەتە، وەڵامدانەوەی واجبە:**

(ابن السني) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((مَنْ أجابَ السلام فَهُوَ لهُ، وَمَنْ لَمْ يُجِبْ فَلَيس منا ...هـەر کەسێك وەڵامی سڵاو بداتـەوە ئـەوا خێرەکـەی بـۆ ئـەوە، هەرکەسێك وەڵامی سەلام نەداتەوە لە ئێمە نیە)).

با باوكو دایکانو پەروەردیاران بزانن، کە هەندێك کاتی

١) بوخاری و موسـلیم گێراویەتیانەوە.

تایبەتی هەیە سڵاوکردن تیایدا باش نیە، وەك لە حاڵەتی: دەستنوێژ هەڵگرتن و لە حەمام، لە کاتێ کەسێك نان دەخوات، یان جەنگ دەکات، ئەو کەسەی یادی خوا دەکات، لە وتاربێژی هەینی، ئەو کەسەی لە مزگەوت ئامۆژگاری خەڵك دەکات، ئەو کەسەی کە بە شتێکەوە سەرقاڵە (پارە دەژمێرێ)و بە وەڵامدانەوەی سەلامەکەی شتەکەی لێ تێك دەچێت، یان لەلای ئاودەستخانە. جا لەو شوێنانەی کە سەلامکردنی تیایدا باش نیە، ئەو کەسەی کە سەلامی لێدەکرێ، بۆی هەیە وەڵام نەداتەوە.

## ئـەدەب و ئاكاری مســـوڵمان
## لەكاتی مۆڵـەت وەرگرتن

ئیزن و مۆڵەت وەرگرتن چەند ئاداب و ڕەفتارێكی هەیە، كە پێویستە باوك و دایك خۆیان و منداڵەكانیان فێر بكەن و ئاگاداریان بكەن، وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَـٰثَ مَرَّٰتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ۚ ثَلَـٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٨﴾ وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَـٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ ﴿٥٩﴾ النـــور

...ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! با ئەوانەی غـولام و كـەنیزی ئێوەن، ئەو كەسانەش لەئێوە، كـە بلـوغ نـەبون، ســێ‌جار

ئیزنی لـێ بخوازن: لەپێش نوێژی بەیانیدا، نیوەڕۆیان، کاتــێ شمەکان دادەنێن و لەپاش نوێژی خەوتنانیش، کـە ئـەم سـێ کاتە وەختی تەنیایی ئێوەن. لەپاش ئەوە، نە بۆ ئێوە قەیدی دەکا، نە بۆ ئەوان، کە بەدەوروبەرتاندا بێت: ئێوە پێکـەوە تێکەڵن. ئا بەجۆرە خودا نیشانەکانی خۆی بۆ ئێوە ئاشکرا دەکا. خودا زانای لەکارزانە. هەرکاتێ منداڵەکان بلوغیان بوو-ئەویش وەك ئەوانی پێشوو- گەرەکە ئیزن بخوازن﴾ .

لەم ئایەتە پڕ تەوجیهو ڕێنموویییەدا، خوای باڵا فەرمان دەکات بە باوك و دایکان، کـە ئـەو منداڵانـەی هەیانـە چ کوڕو چ کچ، کە نەگەیشتونەتە تەمەنی (١٥) ساڵی واتـە بلوغیان نەبووە، با فێریان بکەن لە سـێ حاڵـەت و کاتـدا، دەبێ ئیزن وەرگرن و لە دەرگا بدەن، کاتێك پێویـستیەکیان بە باوك و دایکیان دەبێ.

**سـێ حاڵەتەکەش ئەمانەن:**

یەکەم: لـە پـێش نوێـژی بـەیانی واتـە پـێش بـانگ دان، ئەمەش لەبەر ئەوەی دایك و باوك لـەو کاتـەدا لـە ژێـر پێخەفێکن، کە لـە وانەیـە ڕووت بـن و جـل و بـەرگیان

داماڵیبێ بۆ جووت بوون.

دووەم: کاتی نیوەڕۆ، چونکە لەو کاتەش بە تایبەتی لە وەرزی هاوین، کە کاتی پشودانە، لەوانەیە ژن و مێرد جل و بەرگیان دابکەنن.

سێیەم: لە دوای نوێژی خەوتنان، چونکە ئەو کاتە کاتی نووستن و حەسانەوەیە.

خوای گەورە بۆیە ئەم سێ کاتەی داناوە، کە ئیزنی تیا وەربگیرێ، چونکە ژن و مێرد لە حاڵەتێك دان، کە پێیان خۆش نیە منداڵەکانیان بەم شێوەیە بیانبینن، کە کاری ئاسایی خۆیان ئەنجام بدەن بۆ چێژ وەرگرتن لە یەکتری.

جا گەر لەم کاتەدا منداڵێکی بچوکیان، لەناکاو بچێتە ژوورەوە ئەم دیمەنە ببینێ، ئەوا یەکسەر لە مێشکی دا چاپ دەبێ و کار دەکاتە سەر دەروونی منداڵەکە، کە لەوانەیە ببێتە دروستبوونی رق و قینەیەك لە دڵیدا بەرامبەر دایکی، یان باوکی. هەروەها لەوانەشە هەوڵی ئەنجامدانی کارە جنسییەکەیان بدات، کە ئەمەش منداڵ بەرەو هەڵدێرو زوخاوی لادانی ڕەوشت دەبات. ئەمە

سەبارەت بە منداڵی باڵغەوە ئەوە دەبێ لەم سێ کاتەی، کە باس کراو لە کاتەکانی تریش، کە بیانەوێ بچنە ژووری دایكو باوکیان، دەبێ لە دەرگا بدەن، تا ئیزنیش وەرنەگرن نەچنە ژوورەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴿٥٩﴾ النور...﴾.

هەر سەبارەت بە ئیزن وەرگرتنەوە چەند ئادابێکی تر هەیە، کە بۆ گشتی پیادە دەکرێ وەك:

**أ/ سەلام کردن پاشان ئیزن وەرگرتن:**

وەك ئەبو داود گێڕاویەتیەوە، کە پیاوێك لە بەنی عامر داوای ئیزنی کرد، کە بچێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لە ماڵێك بوو گوتی: ((أألِجْ؟: ئایا بێمە ژوورەوە؟)) پێغەمبەری خوا بە خزمەتگوزارەکەی فەرموو: (بڕۆ لای ئەم پیاوەو شێوەی ئیزن وەرگرتنی فێر بکەو پێی بڵێ: ((قُل السلام علیکم: أأدْخُلْ)) جا لەو کاتەدا پیاوەکە گوێی لێ بوو، گوتی: ((السلام علیکم. أأدْخُلْ؟:

سـلاوتان لــێ بێ، ئایـا بێمـە ژوورەوە؟)) پێغەمبـەریش ڕێگەی پێ داو چووە ژوورەوە.

**ب/ لەکاتی ئیزن وەرگرتن نـاوی، یـان سـیفەتی، یـان نازناوی خۆی ئاشکرا بکات و بڵـێ: من فلانم**

لە صحیحی بوخاری و موسـلیمدا هـاتووە: ((**عـن أبـي موسى لَمَّا جَلَس النبّي ﷺ على بئر البستان، وجاء ابوبكر فاستأذن ، فقال ابو موسى مَنْ؟ قال: ابوبكر ثم جاء عمر فاستأذن فقال: من؟ قال عمر، ثم عثمان كذلك:** ئەبو موسا گوتویەتی: کە لەوکاتەی پێغەمبەرﷺ لەسەر بیری بیستان دانیشتبوو، ئەبوبەکر داوای ئیزنی کـرد، کـە بێتە لای پێغەمبەرﷺ، ئەبو موسا گوتی کێیە؟ ئـەویش گوتی: ئەبوبەکر، پاشان عومەر داوای ئیزنی کرد، گـوتی: کێیە؟ گوتی: عومەر، پاشان عوسمـان بـە هـەمان شـێوە داوای ئیزنی کرد)).

هەروەها لە صحیحی بوخاری و موسلیم هـاتووە، جـابر دەڵـێ: ((**أتيـت النبّـي ﷺ فـدَقَقْتُ البـاب فقـال: مَـنْ ذا؟**

فَقُلْتُ: أنا فقال عليه الصلاة والسلام: أنا أنا كأنه كرهها ...چوومە لای پێغەمبەر، لەدەرگام دا، فەرموی کێیە؟ دەڵێ گوتم: منم، پێغەمبەر فەرموی: من من؟ پێی ناخۆش بوو بڵێم من من)).

ج- ئیزن وەرگرتن (لە دەرگادان) سێ جارە:

وەك لە صحیحی بوخاریو موسلیم دا هاتووە، ئەبی موسای ئەشعەری گوتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((الإستئذان ثلاث، فإن أذِنَ لَكَ وإلاّ فارْجِعْ: ئیزن وەرگرتن (لە دەرگادان) سێ جارە، گەر ئیزنیان دای بێیتە ژوورەوە، ئەوا باشە ئەگینا بگەڕێوە)).

جا لە نێوان ئەم سێ ئیزن وەرگرتنە واباشە بە قەدەر نوێژێکی چوار رکاتی بوەستی نەبادا ئەو کەسەی لە ژوورەوەیە خەریکی نوێژ بێت، یان دەست بە ناو بگەیەنێ.

## د- بە توند لە دەرگـانەدان.

نابێ بە توندی لە دەرگـا بـدرێ، بـا ئەوکەسـە خـاوەن ماڵیش بێ، یان یـەکێك لـە ئەنـدامانی خێـزان بـێ. لـە ئەنەسـەوە ڕەزای خـوای لێبـێ ((إنْ أبـواب رسـول الله ﷺ كانتْ تُقْرَعُ بالأصابع ...بە پەنجـە لـە دەرگـای ماڵـەکانی پێغەمبەر ئەدران))[1].

هەروەها پێشینە صالحەکان بە سـەرەپەنجە لـە دەرگـای ماڵی مامۆستاکانیان ئەدا، کـە ئەمـەش ئەوپـەڕی ڕێـزو ئەدەب دەگەیەنێ. بەڵام هەندێك لە دەرگادان هەیـە کـەوا پێویست دەکات بە توند لە دەرگا بدرێ، ئـەگینا لەوانەیـە گوێیان لێ نـەبێ. بـەڵام گـەر ماڵێـك زەنـگ (جـرس)ی هەبوو، ئەوا دەبێ بە سووکیو لەسەرخۆیی لە جەرەسـەکە بدرێ، کە ئەمەش نیشانەی ڕەوشتو ڕێز دەربڕینە.

---

١) أخرجه البخاري في الادب المفرد.

**هـ- لە كاتی دەرگادان لەلایەكی دەرگا بوەستی:**

ئەمەش بۆ ئەوەیە نەبادا لـەكاتی كردنـەوەی دەرگاكـە ئافرەتێكی بێگانە دەرگا بكاتەوەو، توشی ڕوانینی حـەرام ببێت، ئیزن وەرگرتنیش بۆ ئەوەیە تا توشی ڕوانینی حەرام نەبێت، وەك پێغەمبـەر ﷺ جـەختی لەسـەر كـردووە بـۆ هاوەڵە بەڕێزەكانی‌و فەرمویەی: ((**إنَّما جُعِلَ الإستئذان مِنْ أجْلِ البَصَر** ...ئیزن وەرگرتن بۆ ئـەوە دانـراوە نـەبادا مسوڵمان تووشی ڕوانینی حەرام ببێت))[١].

هەروەها تەبەرانی لە عبداللهی كوڕی بسر ڕەزای خـوای لێبێ گێڕاویەتیەوە، كە گوتوویـەتی: ((**سَمِعْتُ رسـول الله ﷺ يقول: لا تأتوا البيوت من أبوابها ولكـن ائتوهـا مـن جوانبها فاستأذنوا. فإن أُذِنَ لكـم فـادخلوا وإلاّ فـارجعوا:** گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بـوو ئەیفـەرمو: كاتێـك كـە چوونە ماڵێك بەرامبەر دەرگاكـەی مەوەسـتن، بـەڵكو لـە لایەكی دەرگاكە بوەستن‌و لە دەرگا بدەن‌و ئیزن وەرگرن، جا گەر ڕێگەیان پێدان بچنە ژوورەوە، بڕۆنە ژوورەوە، ئـەگینا

---

١) رواه الشيخان.

بگەڕێنەوە دواوەو مەچنە ژوور بە بێ ئیزن پێدانتان)).
هەروا ئەبو داود گێڕاویەتیەوە: ((كان رسول الله ﷺ اذا أتى باب قوم لم يَستَقبل الباب منْ تِلقاء وَجهه، ولكن من ركنه الأيمن أو الأيسر ويقول: السلام عليكم، السلام عليكم)) ...پێغەمبەری خوا گەر بچوبا بەر دەرگای ماڵی كەسێك، بەرامبەر دەرگاكەیان نەدەوەستا، بەڵكو لە لای ڕاستی دەرگاكە یان لای چەپی دەرگاكە دەوەستاو، دەیفەرمو: سڵاوتان لێ بێ، سڵاوتان لێ بێ)).

و- گەر خاوەن ماڵ گوتی بگەڕێوە دەبێ بگەڕێتەوە:

ئەمەش وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا۟ وَتُسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا۟ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُوا۟ فَٱرْجِعُوا۟ ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ﴿٢٨﴾ النور ...ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان

هێناوە مەچنە هیچ ماڵێکەوە بە بێ ئیزن وەرگرتن‌و ڕێگە دان‌و سەلام کردن لە خاوەنی ماڵەکە، ئیزن وەرگرتن لە کاتی چوونە ماڵێك بۆ ئێوە باشترو چاکترە، تا هەردەم لە یادتان بێت. جا ئەو ماڵەی کە بۆی دەچن گەر کەسی تیا نەبوو مەچنە ژوورەوە، تا ڕێگەتان پێدەدەن، گەر پێیان گوتن بگەڕێنەوە، ئێوەش بگەڕێنەوە ئەمە بۆ دڵی ئێوە پاکترە﴾.

مسوڵمانی بەڕێز: ئەوە خوای بەرزو گەورە، ڕێرەو قاعیدەیەکی زۆر جوانی بۆ داناوین، دەبا ئێمە لەسەر خۆمان‌و منالەکانمان بێنینە دی‌و، بەبێ ئاگاداری خاوەن ماڵ‌و لە دەرگانەدان نەچینە ماڵی هیچ کەسێك، بۆیەش ئەڵێم نەچین وەك ئامۆژگاری، چونکە زۆر کەس هەن بە بەڵگەی ئەمە ماڵی خزمە، یان هاوڕێی گیانی بە گیانیمە، یان ماڵمان تێکەڵاوە، یەکسەر خۆی ئەکات بە ماڵدا.

کاتێکیش گەر گوتیان زەحمەت نەبێ بگەڕێوە، ئێستا کاتم نیە دڵ گران نەبێت، چونکە لەو کاتەی تۆ دەچیتە لای ئەو، لەوانەیە گیروگرفتێکی هەبێ‌و سەلیقەی قسە کردن‌و ڕووخۆشی نەبێ یان لەوانەیە.....هتد.

# ئـەدەب و ئاکـاری مسـوڵمان
# لـە کـۆڕو مەجلـیسـدا

## ١- هەرکەسێ هاتە کۆڕو مەجلیسێك تەوقـەی لەگـەڵ بکـــرێ:

وەك (ابـــن الـــسني)و ئـــەبوداود لـــە پێغەمبـــەریان گێڕاوەتـــەوە، کـــە فەرمویـــەتی: ((إذا التقـى المـسلمان، فتصَافَحا وحَمَدا اللهَ تعالى، واستغفرا غفـر الله عـزّ وجـلّ لهما: گەر دوو مسوڵمان بە یەك گەیشتن‌و، تەوقەیان کردو، سوپاسی خوای گەورەیان کردو، داوای لێخۆشبوونیان کرد، ئەوا خوای بەخشندە لێیان خۆش دەبێ)).

هەروەها ترمذي‌و ئـیبن ماجـەو غـەیری ئـەوانیش لـە بەڕائەوە ڕەزای خـوای لێبـێ دەگێڕنـەوە، کـە گوتویـەتی: پێغەمبەری خواﷺ پێی گوتم: ((تصافحوا يَـذْهَبُ الغِـلّ، وتهادوا تحابُّوا و تذهب الـشحناء ...تەوقە لەگەڵ یـەکتری بکەن، چـونکە تەوقـەکردن ڕق‌و قینـە لـە دڵدا ناهێڵـێ،

دیـاری بـۆ یـەكتری بیـەن، یـەكتریتان خـۆش ئـەوێ و، دوژمنایەتی و ناكۆكی نامێنێ)).

**٢- لەو شوێنە دانیشێ، كە خاوەن ماڵ دیاری دەكات:**

**یەكێك گەر چوو بۆ ماڵێك یان كۆڕێك، پێویستە لەو** شوێنە دابنیشێ، كە خاوەن ماڵەكە بـۆی دیـاری دەكـات، چونكە خاوەن ماڵ باشتر بە حاڵی ماڵەكەیەوە ئەزانێ. لـە كۆنیشەوە گوتراوە: ((**أهل مكة ادرى بشعابها** ...خـەڵكی شـاری مەككـە شـارەزاترن بـە ڕێگـەو پـێچ و پـەناكانی شاخەكانیەوە)).

هەروا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**وَمَنْ دخل دار قـومْ فَلْيَجْلِسَ حَيْثُ أمروهُ فإن القـومِ أعلـم بعـورة دارهـم**: گـەر یەكێك چووە ماڵی قەومێك، با لەو شوێنەدا دابنیشێ كـە پێی دەڵێن: لێی دابنیشە، چونكە ئەو قەومە (ئەو كەسە) چاكتر دەزانێ بە حاڵ و باری ماڵەكەی و، دەزانـێ كوێنـدەر جێگەی ئەوە نیە تووشی ڕوانینی حەرام ببێ))[1].

---

١) مجمع الزوائد.

**٣- لە ناوەڕاستی کۆڕو مەجلیس دانەنیشێ:**

ئەبو داود بە ئیسنادێکی (حسن) لە حوزەیفەی یەمانییەوە ڕەزای خوای لێبێ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ((**لَعن مَنْ جَلَسَ في وسط الحلقة** ... پێغەمبەر ﷺ نەفرینی لەو کەسە کردووە، کە لە ناوەڕاستی کۆڕو دانیشتنێکدا دائەنیشێ)). هەروەها ترمذي لە ئەبی میجلەز دەگێڕێتەوە: ((**أنَّ رَجُلاً قَعَدَ وَسَطَ حَلقة فقال حُذَيفة : مَلْعونٌ على لسان محمد ﷺ مَنْ جلس وسط الحلقة** ...پیاوێك لە ناوەڕاستی دانیشتنێك دانیشتبوو، حوذەیفەش گوتی: لەسەر زمانی پێغەمبەرەوە نەفرین لەو کەسە کراوە، کە لە ناوەڕاستی کۆڕو مەجلیسدا دادەنیشێ)) .

دانەنیشتن لە ناوەڕاستی مەجلیسدا ڕەفتارێکی جوانی کۆمەڵایەتییە، کە پێویستە مسوڵمان ئاگادار بێ، چونکە دانیشتن لە ناوەڕاستی مەجلیسدا پشت کردنە لە هەندێك لەو کەسانەی ئامادەی دانیشتنەکەن، کە ئەمەش شتێکی جوان نیە. بەڵام گەر کۆڕو مەجلیسێك شوێنەکەی بچووك و

تەسك بوو، خەڵك ناچار بوو لە ناوەڕاست دابنیشن، ئەوەیان قەیناكەو گوناهی تیا نیە، خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ: خوای گەورە لە دیندا ئەو ئەركانەی لەسەردا نەناون، كە دەبێتە مایەی بارگرانایی‌و ناخۆشی‌و لە توانادا نەبوون﴾.

**٤- لەنێوان دوو كەس دانەنیشێ بەبێ ئیزن وەرگرتنیان:**

وەك ترمذي‌و ئەبو داود لە عەمری كوڕی شوعەیب ئەویش لە باوكی‌و لە باپیرەی دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((**لا يحل لِرَجُلٍ أنْ يَفرُقَ بَيْنَ اثْنَيْنِ إلاّ بإِذنِهِما** ...حەڵاڵ نیە بۆ یەكێك كە لەگەڵ دوو كەسدا بێ‌و بە بێ ئیزنیان ئەوان بەجێ بهێڵێ)). بە مانای پێویستە ئەوان ئیزن بدەن، ئەو كەسە بڵێ: (ڕێگە هەیە بڕۆم؟).

لە گێڕانەوەیەكی ئەبی داود هاتووە: ((**لا يجلسُ بَيْنَ رَجُلَيْنِ إلاّ بإِذنهما** ...هیچ كەسێك لە نێوان دوو كەس بەبێ ئیزنیان دانەنیشێ)). بە مانای داوای ڕێگە دانیان لێ بكات‌و بڵێ (ڕێگە هەیە لەگەڵتان دابنیشم؟).

**٥- ئەو كەسەى دەچێتە لاى یەكێك، یان دەیەوێ بچێتە مەجلیسێك، دەبێ لەكۆتایى مەجلیسەكە دابنیشێت:**

وەك ئەبو داودو ترمذي لە جابرى كورى سەمرە-رەزاى خوایان لێبێ- دەگێڕنەوە، كە گوتویەتى ((**كُنّا إذا أتَيْنا النبّي ﷺ جَلَسَ أحَدُنا حَيْثُ يَنْتَهي** ...گەر بچوینایە كۆڕى پێغەمبەر، ئەوا هەر یەكێك لە ئێمە لە كۆتایى مەجلیسەكە دادەنیشت)).

ئەم جۆرە رەفتارە بۆ مرۆڤێكى ئاساییە، بەلام گەر یەكێكى خاوەن پلەو پایەو زانیارى هات، ئەوا قەیناكە خاوەن مالْ لە شوێنێكى گونجاوو تایبەتى دابنێ.

**٦- لە دانیشتنى سێ كەسدا، با دوو كەسیان قسە بە نهێنى نەكەن:**

وەك بوخارىو موسلیم لە عبدالله كورى مەسعود -رەزاى خواى لێبێ- دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمویەتى: ((**إذا كُنْتُم ثلاثة فلا يَتَناجى اثنان دونَ الثالثِ مِنْ أجْلِ أنَّ ذلك يَحْزُنُهُ**: گەر سێ كەس بوون لە دانیشتنێكدا، با دوو كەسیان قسە بە نهێنى نەكەن بە بێ كەسى سێهەم، چونكە بەمە دلّى گران دەبێو پێى

ناخۆشه)). لەوانەیە بڵێ باسی من دەکەن، یان گومانی تریان پێ ببات. بەڵام گەر لە مەجلیسەکە لە سێ کەسی زیاتری تیدا بوو، ئەوا قەینا کە قسە بە نهێنی بکرێ لە نێوان دوو کەس، بە مەرجێ لەوە نەترسن کە مەجلیسەکە بە گشتی گومانی خراپیان پێ نابەن.

قسەنەکردن بەنهێنیو چرپەچرپ بە ئامادەبوونی سێکەس، ئەوەش دەگرێتەوە، کە بە زمانی جیا قسە بکرێت، جا ئینگلیزی بێت یان تورکی بێت...هتد، کە دروست(جائیز) نیە، پێویستە مسوڵمان خۆی دووربگرێ لەم رەفتارە، بە واقیعیش ئەمە دەبینین، کە زۆربەی تورکمانەکان کاتێك بەیەك دەگەن، بەتورکی قسەدەکەن، بێگوێدان بە کەسی سێهەم، کە ئایا پێی ناخۆشە، یان نا.

**٧- گەر یەکێك لە مەجلیسەکە بۆ پێویستی یەك چووە دەرەوە، نابێ شوێنەکەی بگیرێتەوە، گەر بەنیاز بوو بگەڕێتەوە ناو مەجلیسەکە:**

وەك موسلیم لە ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((**إذا قام أَحَدُكُمْ مِنْ**

مَجْلِسٍ ثُمَّ رَجَعَ إليه فَهُوَ أحَقُّ بِهِ: گەر یەکێك لە ئێوە لە مەجلیسێك هەڵسا و پاشان گەڕایەوە ناو مەجلیسەکە، خۆی لە هەموو کەسێك شایستەترە بە شوێنەکەی خۆی)).

**٨- پێش ئەوەی لە مەجلیسەکە هەڵسێ و بەجێی بێڵێ و بڕوات، داوای ئیزن بکات:**

وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**إنّما جُعِلَ الإستئذان مِنْ أجلِ البَصَرِ** ...داوای ڕێگەپێدان بە هاتنەژوور و چوونەدەر بۆ ئەوەیە، تا تووشی ڕوانینی حەرام نەبن)). دیارە ئەمەش بۆ پاراستن و ڕێز و حورمەتی ماڵەکەیە.

**٩- دانیشتن بە ئەدەب و ڕێزەوە:**

هەرکەسێ لە کۆڕ و مەجلیسێك دانیشت، دەبێ بە ئەدەب و ڕێز و ویقارەوە دابنیشێ، نابێ گەمە بە ڕیشی بکات و خۆی بە ئەنگوستیلەکەیەوە خەریك بکات، نابێ دەست لە لوتی وەربدات، نابێ زۆر باوێشك بدات.

لە مەجلیسەکە دەبێ تەماشای چاوی ئەو کەسە بکات، کە قسەی بۆ دەکات، نابێ ڕوی لەو کەسە وەربگێڕێ.

با زۆر قسە نەکات، بە بەقەدەر شانو باڵای خۆی هەڵنەڵێ، با قسەی کەس نەبڕێ

**١٠- پێش ئەوەی هەڵسن لە مەجلیسەکە دوعای کەفارەت بخوێندرێ:**

وەك حاکم لە ئەبی بەرزە -ڕەزای خوای لێبێ- دەگێڕێتەوە، کە گوتویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بیویستایە لە مەجلیسێك هەڵسێ دەیفەرمو: ((**سبحانك اللهم وبِحَمْدِكَ أشهد أنْ لا إله إلا أنْتَ أستغفرك وأتوب أليك**))، جا پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ قسەیەك دەکەیت کە پێشتر ئەمەت نەدەگوت. پێغەمبەر فەرموی ﷺ: ((**ذلك كَفَّارةُ لِما يكون في المَجْلِسِ** ...ئەم دوعایە کەفارەتی ئەو قسانەیە، کە لە مەجلیسەکە گوتراوە)).

## ئـــەدەب و ئاکـــاری مســـوڵمان لــەکــاتی قســـە کــردندا

لــەو ڕەفتـــارە چـــاك و كۆمەڵایەتیانـــەی، كـــە پێویـــستە مسوڵمان لێـی بـەئاگابێ و بـە گرنگـی دابنـێ، شـێوازی گفتوگۆ و قسەكردن لەگەڵ خەڵكە، پێویستە دایـك و بـاوك منداڵەكانیان لـێ بەهرەمەند بكەن و ڕێنماییان بكـەن بـە پێی تەوجیهاتەكانی خوا و پێغەمبەری پەروەردیار ﷺ.

ئەمەش چەند شێوازو ئادابێكی گفتوگۆ و قـسە كردنـە لەگەڵ خەڵك:

### أ- بە هێمنی و لەسەرخۆ قسـەكردن:

بوخاری و موسلیم لە خـاتوو عایـشەوە -ڕەزای خـوای لێبێ- دەگێڕنەوە: ((ما كانَ رَسول يَسْرد الحديث كَسرِدِكُم هذا، يَحْدِثُ حديثا لَوْ عَدَّهُ العادّ لأَحَصْاهُ: پێغەمبەری خوا ﷺ كە قسەی دەكرد وەك ئێوە قسەی نەدەكرد، بەیەك لە

دوای یەك، بەڵكو بە شێوازێكی وا قسەی دەكرد، كە گەر یەكێك پێویستبوایە بیژمێری، كە چەند وشەی فەرمووە دەیتوانی بیژمێرێ))، هەروا ئەبوداود لە خاتو عایشە - ڕەزای خوای لێبێ- دەگێڕێتەوە، كە گوتویەتی ((كَانَ كلامُهُ ﷺ فَصْلاً يَفْهَمُهُ كُلُّ مَنْ سَمِعَهُ: پێغەمبەر كە قسەی دەكرد لە نێوان وشەكان بەینی ئەدایە، بەشێوەیەكی وا هەر كەسێك گوێی لێبوایە تێدەگەیشت چی فەرموە.

لەم فەرمودە بەڕێزانە بەدەردەكەوێ، كە مرۆڤی مسوڵمان شێوازی قسەكردنەكەی، پێویستە بەهێمنیو لەسەرخۆ بێ، تا خەڵك لێی تێبگەن، نەك هێندە بە خێرایی قسە بكات بۆ خۆیشی نەزانێ چی ئەڵێ، بە تایبەتی وتاربێژ، نابێ ئەم سیفەتەی تیا بێ، كە زۆر لە وتاربێژان لەم هونەرە بێبەشنو خۆشیان بێبەش كردووە، نوێژكەران هەر لە سەرەتای وتارەكەی، تا كۆتاییەكەی لەقسەكانی حاڵی نابن.

**ب- زیادەڕۆیی نەکردن لە بەکارهێنانی وشەی پاراو:**

یەك لە ئادابی قسەکردن ئەوەیە، کە زیادەڕەوی نەکات لە بەکارهێنانی وشەی پاراو لە قسەکردنداو، زمان لوسی نەکات. وەك ئەبوداود و ترمذي بەسەنەدێکی (جید) لە ئیبن عومەر -ڕەزای خوایان لێبێ- دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((إنَّ الله عزّ وجلّ يُبْغِضُ البَليغَ مِنَ الرجال: الذي يخلل بِلسانه كما تَتَخَلَلُ البَقَرُ بِلِسانِها: خوای گەورە ڕقی لەو کەسانەیە، کە لەکاتی قسەکردندا زمان لوسی دەکەنو دەمی خۆیان خوار دەکەن لە قسەکردنداو زمانیان لول دەدەن وەك کە مانگا خواردن بە زمانی لول دەدات و کاوێژ دەکات.

هەروا لە صحیحی بوخاری و موسلیم هاتووە لە ئەنەسەوە، کە پێغەمبەر ﷺ ((ان اذا تكلم بكلمة اعادها ثلاثاً حتى تفهم عَنْهُ... وكان ﷺ يَتَكَلَّمُ بِكلام فَصْلٍ وهِزْرٍ وَلا نزر، وَيَكْرَهُ الثرثَرَة في الكلام والتشَدُّقَ بِهِ ...کاتێك کە پێغەمبەر قسەی دەکرد وشەکانی سێجار دوبارە دەکردەوە تا تێی بگەن،... کە قسەی دەکرد لە بەینی دەربڕینی

وشەکان بەینێکی هەبوو نە زۆر، نە کەم. پێغەمبەر ﷺ زۆر قسەکردنو دەم پانکردنەوەی بەلاوە زۆر پێ ناخۆش بووو ڕقی لێ دەبۆوە)).

دەبا ئێمە ئەم فەرمودانە لە خۆمان بێنینە دیو خێزانو منداڵەکانیشمان فێرکەین، کە زۆر قسە نەکەنو زیادەڕۆیی تیا نەکەنو زمان لوس نەبنو دەم پان نەکەنەوەو بە هێمنی قسە بکەن.

دیاریشە ئەو کەسەی زۆر قسە بکات، هەڵە زۆر دەکات.

**ج- گفتوگۆکردن بە شێوازێك، کە خەڵك لێی تێبگەن.**

مسوڵمانی ژیرو تێگەیشتوو لە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ، هیچ کاتێك بە شێوازێك قسەکانیو وشەی نامۆ بە خەڵك بەکارناهێنێ، بەڵکو گشت کاتێك هەوڵ دەدات، کە قسە دەکات یان وتار دەدات، یان نووسین دەنوسێ، بە گوێرەی تێگەیشتنی خەڵکەکە بێت. وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

**((أُمِرنا مَعَاشِر الانبياء أنْ نُحَدِّثَ الناس على قدر عُقُولِهم**

...ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران فەرمانمان پێکراوە بە

گوێرەی عەقڵی خەڵکەکە، قسەیان لەگەڵ بکەین))[١].

هەروەها لە (صحیح) ی بوخاری هاتووە لە عەلی بە مەوقوفی: ((حَدِّثوا الناس بما يَعْرِفونَ أتُحِبونَ أنْ يُكَذَّبَ اللهُ ورَسُولُه ...خەڵك چۆن دەزانن و تێدەگا، ئاوا قسەیان لەگەڵ بکەن. ئایا پێتان خۆشە خواو پێغەمبەرەکەی بە درۆ بخرێتەوە)).

لێرەدا ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە، کە قسەنەکردن بەگوێرەی عەقڵی خەڵك، بەدرۆخستنەوەی خواو پێغەمبەرە.

لە پێشەکی (صحیح)ی موسلم هاتووە لە ئیبن مەسعودەوە -رەزای خوای لێبێ-، کە گوتویەتی: ((مَا أنت بِحُدِّثِ قوماً حديثاً لا تُبْلِغُهُ عُقُولُهُمْ إلاّ كانَ لِبَعْضِهم فِتنة ...هەر کاتێك تۆ قسە لەگەڵ قەومێك بکەیی و بەگوێرەی عەقڵی ئەوان نەبێ، ئەوا ئەم شێوازە قسەکردنە بۆ هەندێکیان دەبێتە فیتنەو ئاشوب)).

---

١) رواه الديلمي بسند ضعيف بەڵام شایەتی لەسەر زۆرە، کە ئەم حەدیسە (حسن لغيره) (كتاب كشف الخفا).

لەم تەوجیهاتە پڕشنگدارانەدا، پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ بە چاوساغو مامۆستایانو وتاربێژانو ئەدیبانو نووسەرانو ڕابەرانی ئەم پەیامە بەڕێزە ڕابگەیەنێ، کە کاتێك ئامۆژگاری خەڵك دەکەن، وتار دەبێژن، شت ئەنووسن، با بەگوێرەی تێگەیشتنو عەقڵی ئەم خەڵکە بێو وشەی نامۆو ناڕەسەنو بێگانە بە سروشتی مسوڵمانان بەکارنەهێننو، مەهێننە ناو ئەدەبی ئیسلامی ڕەسەن، بە بیانووی ئەوەی ئەمڕۆ وا پێویست دەکاتو لوغەی عەصرە، کە ئێستا زۆر لە نوسەران هەن، چ عەلمانیو چ بەناو نوسەری ئیسلامی، جۆرە وشەی غەریبو عەجیب لە نووسینیانا بەکاردێنن وەك (پراکتیکو ئەلتەرناتیفو مۆدێرنو ستراکتۆرو لۆژیكو سۆسۆلوژیو ئیبستیمۆلۆژیاو هەمە چەشنەی ئەم وشە غەریبانە!!) کە ئەمە بەڕاستی هیچ کاتێك لە خزمەتی ئەدەبی ڕەسەنی ئیسلامیو کوردی نیەو، هیچ سوودێك نابەخشێ، خەڵکیشی لێی تێناگات، مەگەر تەنها مەبەستیان پێ ئەوە بێ، کە خۆیان بە ڕۆشنبیر پیشان بدەنو خۆیان جیاکەنەوە لە خەڵكو خۆیان پێ بەدەرخەن. ئەم شێوازی بەکارهێنانی

وشە غەریبانە، غەزوی زمانەکەمانەو، دەیانەوێ گیانی زیندویی لێ بستێنەوە، دەبا ئەم نوسەرانە لە خوا بترسن‌و بەخۆیان دابێنەوەو بەقسەی پێغەمبەری ئازیزمان بکەن، با بەگوێرەی عەقڵی خەڵك شت بنووسن، وتار بدەن‌و قسە بکەن، گەر خۆیان بە مسوڵمان لەقەڵەم دەدەن‌و شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوان، گەرنا، با ناوێکی تر بۆخۆیان هەڵبژێرن.

**د- قسەکردن بە شێوازێکی وا نە زۆرکورت‌و نەدرێژو وەرزکەر:**

لە ئادابی شیرینکردنی قسەو گفتوگۆ ئەوەیە، نەگاتە رادەی کورت برینەوە، یان درێژدادڕی‌و خەڵك لێ وەرز بوون. ئەمەش بۆ ئەوەیە، تا ئەو کەسەی گوێ ڕادەگرێ، بە دڵ گوێ بگرێ. موسلیم لە جابری کوڕی سەمرە -ڕەزای خوای لێبێ- دەگێڕێتەوە، جابر گوتی: ((**كُنْتُ أُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فكانَتْ صَلاتُهُ قَصْداً، وَخطبَتُهُ قَصْداً** ...لەگەڵ پێغەمبەری خوام نوێژ دەکرد، جا نوێژەکەی‌و وتارەکەی مام ناوەندی بوو)) واتە: نە زۆر کورت‌و نە زۆر درێژ بوو. هەروەها ئیمام ئەحمەد و ئەبو داود لە حەکیمی کوری حزام

-ڕەزای خــوای لێبــێ- دەگێڕێتــەوە، کــە گوتوویــەتی: ((شَهِدتُ مَعَ رَسُولِ الله ﷺ الجُمْعةَ فَقامَ مُتَوكِئاً على عصا -أو قوس- فَحَمَدَ الله وأثْنى عليه، فَكانَتْ كَلِماتٍ خَفيفات طيِّبات مُباركات ...لەگەڵ پێغەمبەری خـوا لـە نوێژی هەینی ئامادە بووم، جا پێغەمبەر لەسەر گۆپاڵێک- یان کەوانێک- وەستاو سـوپاسو ستایـشی خـوای کـردو، چەند وشەیەکی سوکو پیرۆزو باشی گوت)).

هـ- گوێ ڕاگرتــن بۆ ئەوکەسەی قســە دەکات:

لە ڕەفتاری جوانی مسوڵمان ئەوەیــە، کاتێــک یــەکێک قسەی بۆ دەکات گوێی بۆ شل بکاتو، خۆی بە شتێکەوە سەرقاڵ نەکات، یــان تەماشــای تەلــەفزیۆن یــان، ڕوی لــە شتێکی دی نەبێت، کە قسەی بۆ دەکرێ.

هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر کاتێــک، کــە پێغەمبــەر ﷺ قسەی بۆ دەکــردن، زۆر بــە گرنگییــەوە گوێیــان بــۆ ڕادەگرتو خۆیــان بــە شــتێکی تــرەوە ســەرقاڵ نــەدەکرد. پێغەمبەریش ﷺ گوێی بۆ ئەو کەسە دەگرت، کە دەهاتە لای قسەی لەگەڵ دەکرد، یان پرسیارێکی لــێدەکرد.

هەندێ کەس هەیە، کە قسەی بۆ دەکەی، خۆی بە شتێکەوە خەریك دەکات، یان ڕوی لەتۆ نیە، بەڕاستی ئەوە بێڕێزییە، مسوڵمان دەبێ هەستیار بێت، هەستی خەڵك ڕابگرێو گوێ بۆ قسەکانیان شل بکات، ئەگینا کەسی قسەکەر بە چاوێکی سوكو نارێزانە دێتە بەرچاوی.

**و- قسەکردن بە خەندەو ڕوخۆشیەوە:**

ئیمام ئەحمەد لە ئوم دەردائەوە -ڕەزای خوای لێبێ- دەگێڕێتەوە، کە گوتویەتی: کاتێك ئەبودەردا قسەی دەکرد بە خەندەوە قسەی دەکرد، خەڵکیش دەیانگوت ئەبودەردا گەمژەیە (لەبەرئەوەی بە خەندەوە قسە دەکات). ئەبودەردا گوتی: نەبینیومەو نەبیستوومە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ قسەیەکی کرد بێ، بەخەندەوە نەیگوتبێ. جا ئەبودەردا کاتێك قسەی دەکرد دەم بەخەندە بوو، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئاوای کردووە.

هەروەها موسلیم لە سەماکی کوڕی حرب دەگێڕێتەوە، کە گوتویەتی: ((قُلْتُ لجابر بن سمرة رضي الله عنه: أكُنْتَ تُجالِسُ رَسول الله ﷺ؟ فقال جابر: نَعم كثيراً. كان رسول

الله ﷺ لا يَقوم مِنْ مَصَلاَّهُ الذي فيه يُصَلّي الصُبْحَ حتى تَطْلِعَ الشمس، فإذا طَلَعَتْ قام، وكانوا يَتَحَدَّثونَ - والرسول جالِسٌ - فَيَاخُذُون في أمْرِ الجاهليةِ فَيَضْحَكُونَ، وَيَتَبَسَّمُ ﷺ ...بە جابری کوڕی سەمرەم گوت: ئایا لە کۆڕو دانیشتنی پێغەمبەرﷺ ئامادە دەبووی؟ جابر گوتی: بەڵێ، زۆربەی جار ئامادە دەبووم. پێغەمبەری خوا ﷺ لەو شوێنەی خۆی هەڵنەدەستا، کە نوێژی بەیانی تێدا دەکرد، تا ئەوکاتەی ڕۆژ هەڵدەهات، ئەوکاتە هەڵدەستاو دەڕۆیی، جا لەو کاتەی، کە پێغەمبەر دادەنیشت، هاوەڵە بەڕێزەکانی باسی کردەوەی پێشانی جاهیلی خۆیان دەکرد، کە چیان کردووە، جا دەستیان دەکردە پێکەنین، پێغەمبەریش خەندەی دەهاتە سەر لێو)).

ئەمانەی باسکران ڕەفتاری مسوڵمانی مولتەزیمە، تا کردەوەکانی پێ برازێنێتەوە، خۆی لەکاتی قسەکردنو گفتوگۆدا شیرین بکات.

# ئـــەدەبو ئاکـــاری مســـوڵمان لەکـــاتی گـــاڵتـــەو ســـوعبەتدا

مرۆڤی مسوڵمان بۆی هەیە گاڵتە لەگەڵ براکەی بکات، بەڵام لە سنوورێکی دیاریکراوداو، نەبێتە بێئاگایی لە یادی خواو ڕەنجاندنی دڵی برای مسوڵمان.

گاڵتەکردن چەند ئادابێکی هەیە، کە زۆر پێویستە مسوڵمانان پەیڕەوی بکەنو پابەندی بن، کە ئەمانەن:

**أ- زۆر گاڵتەنەکردنو زیادەڕەوی تێدا نەکردنی:**

وەك ئەنەس -ڕەزای خوای لێبێ- گوتویەتی:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((لَسْتُ مِنْ دَدٍ، وَلَا الدَّدُ مِنِّي ...من نە ئەهلی یاریو گاڵتەو لەهوم، نە ئەوانیش لە منن))[1]. زۆر گاڵتەکردن وا لە مسوڵمان دەکات، کە ئەرکە ئاساییەکەی لەبیر بچێتەوە، کە

---

١) رواه البخاري في (الادب المفرد) والبيهقي.

بەندایەتی خواو گێڕانەوەی حوکمی خوایە لەسەر زەوی‌و، پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی چاك‌و پاك‌و ساڵحە.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ، کە نابێ مسوڵمان گاڵتەو یارییەك نەکات، بەڵام ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە کاتی جدیەت دەبێ جدی بێ، گاڵتەکردن هەموو دڵمان دانەگرێ، دەنا خۆ هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەریش گاڵتەو یارییان کردووە، وەك بوخاری لە (الادب المفرد) باس دەکات: ((كانَ أصْحابُ النبّي ﷺ يَتَبادَحُون بالبَطيخ: هاوەڵەکانی پێغەمبەر بۆ گاڵتەو یاری، کاڵەکیان بۆ یەکتری دەهاویشت‌و بەیەکتری یان دائەدا)).

لە ڕاستیدا زۆر گاڵتەکردن دەبێتە مراندنی دڵ‌و، ڕق لە یەکتری بوونەوەو نەمانی هەیبەت‌و ویقار، وەك ئیمامی عومەر -ڕەزای خوای لێبێ- فەرمویەتی ((مَنْ كَثُرَ ضحكه قلت هيبته ومَنْ مَزَحَ استُخِفَّ بِهِ ...هەر کەسێك زۆر پێبکەنێ، هەیبەت‌و ویقاری کەم ئەبێتەوە، هەر کەسێك سوعبەت‌و گاڵتە بکات پێی سووك دەبێت)).

**ب- لە کاتی گاڵتەکردنەکەدا نابێ مەبەستت پێ ئازار گەیاندن و دڵ ئێشانی هیچ کەسێ بێ:**

زۆر کەس هەن تەنانەت لە نێو مسوڵمانانیش گاڵتە ئەکرێ، کە مەبەستی پێ ئازاردانی دڵی مسوڵمانانە، دیارە ئەمەش کارێکی ناشیاوی مسوڵمانانەو پێغەمبەری خوا قەدەغەی کردووە، لەم جۆرە گاڵتانەی، کە دەبێتە ئازاردان و هەست بریندارکردنی مسوڵمان وەك لە سونەنی ئەبی داودو ترمذي هاتووە، لە عبدالله کوڕی سائیبەو ئەویش لە باوکییەوە لە باپیرەیەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە ، کە دەیفەرمو: ((**لا يأخُذَنَّ أحَدُكُمْ مَتاعَ أخيه لاعباً وَلا جاداً، وَمَنْ أخَذَ عَصا أخيهِ فَلْيَرُدَّها** ...با هیچ کەسێك لە ئێوە شتێکی براکەی بەگاڵتە، یان بەڕاستیش لێی نەبات و نەشارێتەوە، هەر کەسێکیش گۆپاڵی براکەی برد با بۆی بگێڕێتەوە)).

لە جەنگی (خندق) زەیدی کوڕی سابت لەگەڵ مسوڵمانان خۆڵی ئەگواستەوە، پاشان زۆر ماندوو بوو، سەرخەوێکی شکاند، جا عمارەی کوڕی حەزم هات و

چەکەکەی لێبرد، کە پێغەمبەرﷺ ئەمەی زانی یەکسەر قەدەغەی ئەم کارەی لێکرد.

هەروەها بەزارو تەبەرانیو ئیبن حەبان لە عامری کوڕی رەبیعەوە -رەزای خوای لێبێ- دەگێڕنەوە، کەوا پیاوێك پێلاوی پیاوێکی بردو بەگاڵتەوە لێی شاردەوە، جا کە ئەمەیان بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((لا تُرَوِّعوا المُسْلِم، فإنَّ روْعةَ المسلم ظُلْمٌ عظيم ...مسوڵمان مەترسێنن، چونکە ترساندنی مسوڵمان زوڵمو ستەمێکی زۆر گەورەیە)). هەروەها ئەبو داود لە عبدالرحمنی کوڕی ئەبی لەیلا دەگێڕێتەوە، کە گوتویەتی: هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ دەڕۆیشتن، پاشان پیاوێك لەوان خەوی لێکەوت، جا هەندێکیان هەڵسان ئەو گوریسەی کە ئەم پیاوە پێی بووە لێیان بردووەو...پیاوەکە هەڵساوەو ترساوە. ئینجا پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((لاَ يَحِلُّ لمسلمٍ أنْ يُروِّعَ مُسلماً ...بۆ مسوڵمان حەڵاڵ نیەو حەرامە برا مسوڵمانەکەی بترسێنێ)).

جا ئێمە لە کوێ لە ئاست ئەم فەرمودە بەرێزانە لەکاتێکدا خۆمان بە شوێنکەوتەی رێبازی ئیسلام دادەنێین.

## ج- لە گاڵتەكردندا نابێ قسەی درۆی تیا بێ:

زۆر كەس هەن لـە دانیـشتنی مەجلیـسێكدا بۆئـەوەی بڵێن فلانەكەس سوعبەت چی‌و قسەی خۆشە، هەڵدەسـتێ بەگێڕانەوەی نوكتەی درۆو پێكەنین هێنەر، لەوانەشە خـۆی بە مـسوڵمان بزانێ، بێ ئاگاشە لە هەڕەشـەی پێغەمبـەری خواﷺ لەو كەسانەی، كە قسە دەگێڕنەوە بەدرۆ تا خـەڵك پێ بكەنن. وەك ئەبو داودو ترمذي‌و نەسائی‌و بەیهەقی لە بوهزی كوڕی حەكیم لە باوكی لە بـاپیرەی -ڕەزای خوایـان لێبێ- دەگێڕنەوە، كە گوتویـەتی: گـوێم لـە پێغەمبـەری خـواﷺ بـوو دەیفـەرمو: ((وَيـلٌ للـذي يَحْـدِثُ بالحـديث لِيُضْحِكَ بِهِ القوم فَيَكْذِب ويلٌ له، ويَلٌ لـه ...ماڵ وێرانی‌و چاڵی دۆزەخ بۆ ئەو كەسەی قسە دەكات بۆ ئـەوەی خـەڵك بە پێكەنین بێنێ، لەكاتێدا قسەكەی درۆیە، جا پێغەمبـەر دوو جار پێی دەڵێ: ماڵ وێرانی بۆ ئەو كەسە)).

هەروەها لە نەواسی كوڕی سەمعانەوە، كە گوتویـەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((كَبُرَتْ خِيانةً أنْ تُحَدِّثَ أخاك هوَ لك مُصَدِّقٌ، وأنتَ له كاذبٌ...گەورەترین خیانەت

ئەوەیە، کە قسەی درۆ بۆ برا مسولمانەکەت بکەی، لە کاتێکدا ئەو باوەڕت پێبکات و وا بزانێ قسەکەت ڕاستە))[1].

هەروەها ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێبێ- گوتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((**لا يؤمنُ العَبْدُ الايمانَ كلّه حتى يترك الكذب في المزاحة، والمراءَ وإنْ كان صادقاً** ...ئیمانی مسولمان بەتەواوی هەمووی دانامەزرێ، تا لە گالتەکردندا واز لە درۆ نەهێنێ و، واز لە دەمەتەقێ و موجادەلە نەهێنێ، ئەگەر چی ئەویش ڕاست بکات.

دەمێکە شتێکی زۆر ناشیرین خۆی خزاندۆتە ناومان و ئێمەش بە پێشوازیەکی گەرمەوە قبولمان کردووە، ئەویش درۆی نیسانە، کە لەڕاستی دا ئەمە ڕەفتارێکی بەدکاری ناشیرینی ڕۆژئاوایە بۆ ئێمەیان ناردووە، تا ڕەوشتی ئێمە بڕوشێنن. کە لەڕاستیدا ئەم درۆکردنە حەرامێکی گەورەیە و گالتەکردنێکی ناحەقە، پێویستە خۆمان و مالو منداڵمان لێی بەدوور خەین و بەقسەی ڕاستگۆیانە

١) رواه احمد وابو داود.

کردارەکانمان برازێنینەوەو، تەقواو لەخوا ترسان هەردەم دڵمان بگەشێنێتەوە.

با ئێستاش بزانین، ئایا پێغەمبەر ﷺ سوعبەت‌و گاڵتەی کردووە؟

بەڵێ، گاڵتەی کردووە، بەڵام ئەوەی ڕاست نەبووبێ نەیگوتووە، ئەمەش نموونەی گاڵتەکردنی پێغەمبەرە:

ئیبن بەکار لە زەیدی کوڕی ئەسلەم دەگێڕێتەوە، کە ژنێك هەبووە پێیان دەگوت (أم أيْمَن الحبشية)، هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺو گوتی: مێردەکەم بانگت دەکات، پێغەمبەریش فەرمووی مێردەکەت کێیە؟ مێردەکەت ئەو پیاوەیە کە سپیایی بە چاوییەوەیە؟

ژنەکەش گوتی: چاوی سپیایی پێوە نیە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر سپیایی بە چاوییەوەیە.

ژنەکە گوتی: بەخوا سپیایی بە چاوییەوە نیە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ کەسێك هەیە سپیایی بە چاوییەوە نەبێ. (مەبەستی پێ سپیایی ناوەوەی چاو بووە).

هەروەها ترمذی لە حەسەنی بەسری -رەزای خوای لێبێ- دەگێڕێتەوە، کە گوتویەتی: پیرەژنێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوعام بۆ بکە خوای بەخشندە بمباتە بەهەشت.

پێغەمبەر فەرموی: دایکی فلان! پیرەژن ناچێتە بەهەشت.

گوتی: پیرەژنەکە بەگریانەوە ڕۆیشت.

جا پێغەمبەر فەرموی: (پێی بڵێن ئەو بە پیرەژنی ناچێتە بەهەشت، بەڵکو بە گەنج و لاوی دەچێتە بەهەشت).

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾﴾ الواقعة. ئێمە خۆمان کیژەکانمان بەتایبەتی بەرهەم هێنا، بڕیارمان بۆدان هەر کچ بن، شۆخ و شەنگ و هاوتەمەنن﴾.

## ئــەدەب و ئاكـاری مســوڵمان لــە پیــرۆزبایی كــردنــدا

لە ڕەوشتی جوانی مسوڵمان ئەوەیە، كاتێـك برایـەكی مسوڵمان ژن دێنی، یان خوشكێكی مسوڵمان شوو دەكات، یـان خـوا منـداڵێكی پێدەبەخشێ ...هتـد، پیرۆزبـایی لـێبكرێ.

جا پیرۆزبایی كردن چەند ئادابێكی هەیە وەك:

**أ- كاتێك مسوڵمانێك خۆشی و شادیەك ڕووی تێدەكات، دڵخۆشی خۆتی بۆ بەدەرخەی و گرنگی پێبدەی:**

بەڵگەشمان ئەوەیە، كە لە (صحیح)ی بوخاری موسـلیم داهاتووە، كەعب دەڵێ: گوێم لە دەنگێك بوو هاواری دەكرد بە بەرزترین دەنگ و دەیگوت: ئەی كەعبی كـوڕی مالـك! مـژدەت لـــێبێ، جـا خەڵكەكـە ئـەهاتن پیرۆزباییـان لـــێدەكردین و یەكـسەر مــن دەرچـووم، تـا بگەمــە لای

پێغەمبەری خوا ﷺ، پۆل پۆل خەڵك پیرۆزبایی قبوڵکردنی تەوبەیان لـێ‌کردم، دەیانگوت: تەوبـە قبوڵکردنـت لـەلای خواوە پیرۆز بێ، تا گەیشتمە مزگەوتو بینـیم خەڵکەکـە بەدەوری پێغەمبەرن، جا یەکسەر تەلحەی کـوڕی عبیـدالله بە غاردانەوە هاتە لامو تەوقەی لەگـەڵ کـردمو پیرۆزبـایی لـێ‌کردم، (کەعب ئەم هەڵوێستەی تەلحەی هـەرگیز لـەبیر ناچێ) کەعب گوتی: کاتێك سەلامم لە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کرد لە خۆشیانا دەموچاوی ئەدرەوشایەوەو فـەرموی: ((أبشِر بخيرِ يومٍ مَرَّ عليك منذُ وَلَدتْكَ أُمُّكَ: مژدە بێ لێت بە چـاکترین ڕۆژ، کـە بـە سـەرت تێپـەڕبووە لـەو ڕۆژەی لەدایك بوویی)).

**ب- لەکاتی بۆنەو موناسـەبەدا وشـەی جـوانو ناسـك دەربڕینو دوعای خەیـرکردن:**

ئیسلامی بەرنامە دارێژراوی پـەروەردگاری جیهانیـان، هیچ شتێکی کۆمەڵایەتی فـەرامۆش نـەکردووە، تەنانـەت قسەو وشەو دوعای جوانو ناسـکی دانـاوە بـۆ پیرۆزبـایی کردن، کە پێویستە مسوڵمانان لەبیری نەکەنو لە ژیانیاندا

پەیڕەوی بکەن‌و خەڵکیش لـێ فێربکەن. لەمانەش وەك:

١/ پیرۆزبایی کردنی یەکێك گەر خوا منداڵی پێبەخشین:

گەر خوا منداڵێکی بە مسوڵمانێك بەخشی، وا چاکە پیرۆزبایی لـێبکەی‌و بڵێی: (بُورِك لَكَ الموهوبْ، وَشَكَرْتَ الواهبَ، وَرَزَقْتَ بِرَّهُ، وَبَلَغَ أشُدَّهُ)). وا باشە ئەو کەسەی پیرۆزبایی لـێدەکرێ وەڵامـی بداتـەوە، بڵـێ: ((بـارك الله لَكَ، وبارك عَلَيكَ، وَرَزَقَك مِثْلَه)). ئەم جۆرە پیرۆزبایییە لە حوسـەینی ئیمـام عـەلی‌و ئیمـام حەسـەنی بەسـری گێڕراوەتەوە.

٢- پیرۆزبایی کردن لەو کەسەی لە سەفەر هاتۆتەوە:

ئەو کەسەی لە سەفەر دێتەوە، واباشە ئەم قسەیەی پێ بڵێی وەك، کە لە پێشینەوە گێڕراوەتەوە: ((الحمدلله الذي سَلَّمَك، وَجَمَعَ الشَّمْلُ بِكَ وأكرمك)).

٣- پیرۆزبایی کردن لەو کەسەی لە مەیدانی جیهاد دێتەوە:

ئەو کەسەی کە لە جیهاد دەگەڕێتـەوە، وا باشـە پـێی بگوترێ: ((الحَمْدُ لله الذي نَصَرك، وأعَزَّكَ وأكرَمك)). وەك

خاتوو عائیشە بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە كاتێك، كە لە جیهاد گەڕاوەتەوە، موسلیمو نەسائیو غەیری ئەوانیش لە خاتوو عائیشە دەگێڕنەوە، كە گوتویەتی: ((كانَ رسول الله ﷺ في غزوٍ، فَلَما دَخَلَ استقبلتهُ فأخَذْتُ بيده فقلت: الحمدلله الذي نصرك وأعزكَ وأكرمكَ ...پێغەمبەری خوا لە جەنگێك گەڕایەوە، كاتێك هاتەوە پێشوازیم لێكردو دەستیم گرتو گوتم: سوپاس بۆ خوا كە سەری خستیو بە عیززەتی كردیو ڕێزی گرتی)).

٤- پیرۆزبایی كردن لەو كەسەی كە لە حەج دێتەوە:

ئەو كەسەی لە حەج دەگەڕێتەوە، وا باشە پێی بگوترێ: (قَبِلَ الله حَجَّكَ، وَغَفَر ذَنْبَكَ، وأخْلَفَ نَفَقَتَك) ئەم جۆرە پیرۆزباییە، پێغەمبەری خوا بە كوڕێكی گوتوە، كە لە حەج گەڕاوەتەوە، ابن السني لە ئیبن عومەر گێڕاویەتیەوە.

٥- پیرۆزبایی كردنی ژن هێنانو شووكردن:

كاتێك كە مارەی كچو كوڕێك دەبڕڕێ، وا باشو سوننەتە، كە پیرۆزباییان لێبكرێو بگوترێ: ((بارَكَ الله

لـكَ، وبـارك عليْـكَ، وَجَمَـعَ بيْنَكُمـا في خَيْـرٍ)). ابـو داود وترمـذي وغـەيری ئەوانيش لە ئەبو هورەيرە -ڕەزای خـوای لێبێ- دەگێڕنەوە، کە کاتێك يـەكێك ژنـی بهێنايـە، يـان شووی بكردبايـە، پێغەمبـەر ﷺ ئەيفـەرمو: ((بـاركَ الله لكَ، وبارَكَ عليْكَ، وَجَمع بينكما في خَيرٍ)).

٦- پیرۆزبایی کردن لە کاتی جەژندا:

وا باشـە لـەدوای نوێـژی جـەژن مـسوڵمان بـە بـرای مسوڵمانی بڵێ: ((تَقَبَل الله منّا ومِنْكَ... خوا لـە ئێمـەو ئێوە وەربگرێ) بەرامبەرەکەشی هەمان شتی وەڵام داتەوە.

٧- گەر کەسێك چاکەی لەگەڵ کـردی وا چـاكو سـوننەتە پێی بڵێی: (بـارك الله لك في أهلـك ومالـك، وجـزاك الله خيْراً).

ئەمەش وەك نەسائیو ئیبن ماجە لە عبداللّـەی کـوڕی ئەبی ربیعەیان گێڕاوەتەوە، کە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چل هەزاری لـێ قەرز کردم، کاتێـك کـە پـارەی بـوو قەرزەکـەی دامـەوە فـەرموی: ((بـارك الله لـك في أهلـك ومالك، إنما جزاء المُسْلَفِ الحَمْدُ والثنـاء ...خوا بەرەکـەت

بهاوێته ماڵو منداڵتو سامانت، بەڕاستی پاداشتدانەوەی قەرزدەر سوپاسو ستایش کردنیەتی)). ترمذي لە ئوسامەی کوڕی زەید -ڕەزای خوای لێبێ- دەگێڕێتەوەو ئەویش لە پێغەمبەری خوا ﷺ، کە فەرمویەتی: ((مَنْ صَنَعَ اليه مَعْروف فقال لفاعله: (جزاك الله خيرا)، فقد بلَغ في الثناء ...هەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵ کراو بە چاکەکەرەکەی گوت: (خوا پاداشتت بداتەوە) ئەوا سوپاسو ستایشی کردووە)).

**ج- لەگەڵ پیرۆزبایی کردن واباشە دیاری پێشکەش بکرێ:**

گەر خوا منداڵی بە کەسێك بەخشی، یان ژنی هێناو شووی کرد، واباشە دیاری پێشکەش بکرێ، وەك لە چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کراوەو هانی لەسەر داوە لەمانە:

- لە خاتوو عائیشەوە بە مەرفوعی، کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((تَهادوُا تحابّوا ...دیاری، بۆ یەکتری ببەن، یەکتریتان خۆش دەوێ))[1].

---

١) رواه الطبراني في الاوسط.

- لە ئەبوهورەیرە بە مەرفوعی: ((تَهادوا فإنَّ الهدية تَذْهَبُ وَحَرَ الصَدْرِ ...دیاری پێشکەشی یەکتری بکەن، چونکە دیاری ڕقو قینی دڵ ناهێڵێ))[1].
- لە ئەنەسەوە بە مەرفوعی: ((عليْكُم بالهدايا فإنَّها تُورثُ المودة. وتَذْهَبُ الضَغائن ...دیاری پێشکەش بە یەکتری بکەن، چونکە دیاری دەبێتە مایەی خۆشەویستیو ڕقو قین لەدڵ ناهێڵێ))[2].

سەبارەت بە دیاری بردن دیاردەیەکی سەیر لە کۆمەڵگەی ئێمە دەبینرێ ئەویش ئەوەیە، کە خێزانێك.. ماڵێك.. کەسێك خۆی ئەخاتە ژێر باری قەرزەوە، لە ڕاستیدا ئەمە پێچەوانەی ڕێنموویيەکانی پێغەمبەرە ﷺ. مەرج نیە هەر دەبێ شتێك گرانبەها بێت، یان پارەیەکی زۆر بێ، بەڵکو ئەمە شتێکی ڕەمزییە، کەوا تۆ خۆشەویستی خۆتی بۆ دەردەبڕی، نەك خۆ خستنە ژێر باری قەرزێك، کە خۆت حەزی پێناکەیتو لە شەرمی ڕوان ئەم دیاریە گرانبەهایە پێشکەش دەکەیت.

---

١) رواه البخاري في الادب المفرد واحمد.

٢) رواه الديلمي.

# ئـەدەب و ئاكـاری مسوڵمانان
# لە كاتی سـەردانی نەخۆشدا

مـسوڵمانان كـە بەڕاسـتی بـرای یـەكترین، وەك یـەك جەستەو لـەش وان، كـە كاتێـك ئەنـدامێكی ئـەم لەشـە دەكەوێتە ئازار، گشت ئەندامـەكانی تـر ئەكەونـە ئـازار. مسوڵمانیش تا لە ژیان دابێ، تووشی نەخۆشیو نەسـاغی دەبێ. نەخۆشیش وەك هەموو كەس دەیزانێ، پێویستی بە سـەردانو دڵدانـەوەو دڵ ڕاگـرتن هەیـە، تـا ئـازاری نەخۆشیەكەی لەسەر كەم بێتەوە.

جـا بـۆ چـوونە لای نـەخۆش، ئیـسلام ئـەم بەشەشـی فەرامۆش نـەكردووە، بـەڵكو چـەند ئـادابو ڕەفتـارێكی دانـاوە، پێویـستە مـسوڵمانان بۆخۆیـان بـە گـشتیو منداڵەكانیشیان لـێ فێر بكەن.

ئادابەكـانیش ئەمانەن:

### أ- پەلەکردن لە سەردانی نەخـۆش:

کاتێـــك مـــسوڵمانێك دوچـــاری نەخۆشـــی دەبـــێ، وا پێویـــستو چـــاکە، یەکـــسەر بـــچێتە ســـەردانی، وەك پێغەمبـــەر ﷺ فەرمویـــەتی: ((إذا مَـرِضَ فَعِـدْهُ ...گـەر مسوڵمانێك نەخۆش کەوت، یەکسەر سەردانی بکە)).

### ب- کـەم مانەوە لای نەخـۆش:

لە ڕەوشتی جوانی مسوڵمان لەکاتی سـەردانی بـۆ لای نەخۆش ئەوەیە، کە زۆر لەلای نەمێنێتەوە، بەتایبەتی گەر نەخۆشەکە ئافرەت بوو. بەڵام گەر نەخۆشەکە حاڵەتی باش بوو، سەلیقەی قسەکردنی هەبوو، ئـەوا قەیناکـە زۆریـش لەلای بمێنێتەوە، واچاکە ڕۆژێك نا ڕۆژێك سەردانی نەخۆش بکرێت، گەر حاڵەتی چاك بوو.

### ج- دوعـاکردن بۆ نەخـۆش:

کاتێك دەچیتە لای نەخۆشێك، واباشە دوعـای شـیفای بۆ بکـەی، وەك ئـەم دوعایـەی، کـە پێغەمبـەر ﷺ بـۆ نەخۆشـی کـردووە. لـە خـاتوو عائیـشەوە -ڕەزای خـوای لێبێ-، کە کاتێك پێغەمبەر ﷺ خێزانی نـەخۆش بـووە،

چووەتە لای و دەستی ڕاستی بەسەردا هێناوەو فەرمویەتی: ((اللّهم رَبَّ الناس. أذهَبْ البأس، إشفِ أنتَ الشّافي لا شِفاء إلاّ شِفاؤكَ، شِفاءً لا يُغادِرُ سَقَماً ...خوایە ئەی پەروەردگاری خەڵك، نەخۆشی لادە. شیفا بنێرە هەر تۆ شیفادەری و هیچ شیفایەکی نەخۆش نیە، جگە لە شیفای تۆ، شیفایەك بنێرە کە نەخۆشی بە دواوە نەبێ))[1].

هەروەها ئیبن عەباس گوتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((مَنْ عاد مريضاً لَمْ يَحْضُرْهُ أجَلُهُ فقالَ عِنْدَهُ سَبْع مراتٍ: (أسأل الله العظيم ربُّ العرش العظيم أنْ يَشْفيك إلاّ عافاهُ الله مِنْ هذا المرضْ)) ...هەر کەسێك سەردانی نەخۆش بکات، بەمەرجێ ئەجەلی نەهاتبێ، حەوت جار بڵێ: ((أسأل الله العظيم رب العرض العظيم أن يشفيك ...لە خوای بەرزو مەزن داوا دەکەم، کە خوای عەرشی گەورەیە شیفات بۆ بنێرێ))، ئەوا خوای گەورە لەم نەخۆشیە چاکی دەکاتەوە))[2].

---

١) بوخاری و موسلیم گێڕاویەتیانەوە.

٢) ئەبوداود و حاکم و ترمذي گێڕاویەتیانەوە.

با ئێمەش هەردەم دوعایەنەمان لـەیادبێ تـا پاداشـتی خوا بەدەست بێنین‌و دڵنەوایی نەخۆشەکان بین.

**د- دەست خستنەسەر شوێنی ئازارەکەو دوعـا خوێنـدن بەسەریدا:**

لە ئەبی عبداللّەی عوسمانی کوڕی ئەبی العاصەوە، کەوا لە لەشیدا، شوێنێکی ئازاری هەبووەو، بە پێغەمبەری ﷺ فەرموە، کە ئەم ئازارەی هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ پـێی فەرمو: ((ضَعْ يدكَ على الذي يألَمُ مـن جسدكَ قـلْ: بـسمِ الله – ثلاثاً- وقلْ سَبْعَ مـراتٍ: أعـوذ بعـزةِ الله: دەسـتت لەسەر ئەو شوێنە دابنێ کە ئازار بە لەشت ئەگەیەنێ سـێ جار بڵێ: بسم الله و حەوت جاریش بڵـێ: (أعـوذُ بعـزة الله وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ ما أجِدُو أُحاذِرْ ...پەنا دەگرم بە عیـزەت‌و هێزو توانای خوای گەورە لە خراپەی ئەو شتەی کە هەمەو حەزەریش وەرئەگرم))[١].

١) موسیلم گێڕاویەتیەوە.

**هـ- وا چاکـە لە ئەحواڵی نەخۆش پرسیار بکەی:**

لە ئیبن عەباسەوە کەوا عەلی کوڕی ئەبی تالب -ڕەزای خوای لێبێ- **((خَرَجَ مِنْ عند رسول الله ﷺ في وَجْعِهِ الذي توفي فيه عليه الصلاة والسلام، فقال الناس: يا أبا الحسن كيف أصبح رسـول الله؟ قـال: (أصْبَحَ بِحَمْدِ الله بارِئـاً)** ...لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ هاتـە دەرەوە، کـە نـەخۆش بوو بەو نەخۆشیەی، کە گیـانی پێ‌سـپارد. جـا خەڵکەکـە گوتیان: ئەی باوکی حەسەن! پێغەمبەری خـوا ﷺ حـاڵی چۆنە؟ گوتی: سوپاس بۆ خوا چاکە))[١].

**و- واچاکـە لەلای سەری نەخۆش دابنیشـی:**

ئەمەش وەك کە پێغەمبـەر ﷺ ئـاوای ڕەفتـارکردووە، وەك ئیبن عەباس -ڕەزای خوایان لێبێ- گوتویەتی: کاتێك پێغەمبەر ﷺ سەردانی نەخۆشی دەکرد، لـەلای سـەریەوە دادەنیشتو پاشـان حـەوت جـار ئەیفـەرمو: **((أسـأل الله العظيم رب العرش العظيم أن يشفيك))**، جا گەر ئەجـەلی

---

١) بوخاری گێڕاویەتیەوە.

دوا بخرێ، ئەوا لەم نەخۆشییەی چاك ئەبێتەوە[١].

## ز- دڵدانەوەی نەخۆش و ئاوات خواستن بە چاکبوونەوەو تەمەن درێژی:

ئەم سیفەتە دڵڕفێنە کاریگەریەکی بە تینی هەیە لەسەر دڵ و دەروونی نەخۆش، هەروا دەبێتە دڵخۆشکردنی و هیوا پێدانی.

ئەبی سەعیدی خودری -ڕەزای خوای لێبێ گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: **((إذا دَخَلْتُمْ على مريضٍ فَنَفِّسوا له أجَلَهُ (بِطول العمر)، فإنَّ ذلك لا يَرِدُ شيئاً، وَيَطيبُ نَفْسَهُ** ...گەر چوونە لای نەخۆش داوای تەمەن درێژی بۆ بکەن، چونکە ئەمە هیچ شتێك ڕەت ناکاتەوەو دڵیشی پێ خۆش دەبێ))[٢].

هەروا لە حەدیسی ئیبن عەباسدا هاتووە، کە بە نەخۆش دەگوترێ: **((لا بأس طهور إنشاء الله** ...قەیناکە إن شاء الله بوەتە مایەی پاککردنەوەی گوناهەکان)).

---

١) بوخاری لە (الادب المفرد)، گێڕاویەتیەوە .

٢) ترمذي و ئیبن ماجە گێڕاویەتیانەوە.

## ح- واچاکە داوای دوعــا لە نەخۆش بکەیت:

وەك ئیبن ماجەو ئیبن السني لە عومەری کوڕی خەتاب -ڕەزای خوای لێبێ دەگێڕنەوە، کە گوتویەتی: پێغەمبەری خــوا ﷺ فەرمویــەتی: ((إذا دَخَلْـتَ علـی مـریضٍ فَمُـرْهُ فَلْیَدْعُ، فإنَّ دُعاءَهُ كَدُعاء الملائكـة ...گــەر چــوویتە لای نەخۆش پێی بڵێ دوعات بۆ بکات، چونکە دوعاکەی وەك دوعای فریشتەکان وایە)).

## گ- گــەر نەخۆشــێك لە حاڵەتی گیاندان بــوو (لا إلــه إلا الله)ی بیــربخرێتەوە:

ئەبی سەعیدی خودری -ڕەزای خوای لێبێ- گوتویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((لَقِنـوا مَوْتـاكُمْ لا إلـه إلا الله ...ئەو نەخۆشانەی کە لە حاڵەتی مردنـدان پێیـان بڵێن: (لا إله إلا الله) بڵێن))[1].

هەروەها مەعازی کوڕی جەبەل -ڕەزای خوای لێبــێ - گوتویەتی: پێغەمبـەری خوا ﷺ ((مَنْ كان آخِـرُ كَلامـه لا

١) موسلیم گێڕاویەتیەوە.

إله إلا الله دَخَل الجنّة ...هەركەسێك لـەكاتی گیانـدانی، كۆتا قسەی لا إله الا الله بێت، دەچێتە بەهەشت))[1].

١) ئەبو داودو حاكم گێڕاویەتیانەوە.

## ئـەدەب و ئاکـاری مسـوڵمان لە پرسـەو تەعزیـەدا

پرسەو سەرەخۆشـی چـەند یاسـاو ئـادابێکی تایبـەتی هەیە، کـە پێویـستە مـسوڵمان پـەیرەوی بکـەن‌و خۆیـان دوورخەنەوە لە ئاکارو داب‌ونەریتە نەفامیەکانی ئەمڕۆ.

یاساو ئادابەکانیش ئەمانەن:

**أ- دوعـاکردنی پاداشـتدانەوە بۆ خاوەن پرسـەکە:**

ئیمـامی نـەوەوی لـە کتێبەکـەی (الاذکـار)دا دەڵـێ: باشترین قسە، کە بە خاوەن مردوو بگوترێ ئەوەیە، کە لـە (صحیح)ی بوخاری موسلیمدا هاتووە، لە ئوسامەی کوری زەیدەوە، کە گوتویەتی: (یەکێك لە کـچەکانی پێغەمبـەر ﷺ نێردرایە لای پێغەمبەر ﷺ تا بـانگی بکـەن‌و پێـی بڵێن منداڵێکی کـچەکەی لەسـەر مردنـە. پێغەمبـەریش فەرموی بگەڕێوە لای‌و پێی بڵێ: ((إنّ لله ما أخذَ، وَلَهُ ما أعطى. وكُلّ شيءٍ عِنْدَهُ مُسَمّى، فَمُرها فَلْتَصْبِر ولْتَحْتَسِب

...خوای گەورە بۆی هەیە، ئەوەی هەیە بیباتەوە، وە بۆیشی هەیە، کە ببەخشێ، هەموو شتێکیش لای ئەو، ماوەی دیاریکراوە. جا پێی بڵێ با ئارام بگرێ‌و داوای پاداشت لە خوا بکات)).

ئیمامی نەوەوەی دەڵێ: شێوازی پرسەنامە هیچ حەرامی تێدا نیە، بە هەر چ شێوازێك پرسە دەکەی، دروستە. بەڵام وا باشترە لە پرسەی مسوڵمان بگوترێ: ((أعظَمَ اللهُ أجْرَك، وَأحْسَنَ عَزاءَكَ، وَغَفَرَ لِمَيتِك))، واباشە پرسەکردنی مسوڵمان بۆ کافر بەم شێوەیە بگوترێ: ((أعظم الله أجركَ، وأحسن عَزاءكَ)).

## ب- بەباشدانانی چێشت دروستکردن بۆ خاوەن مردوو:

بۆ پتەوکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی، ئیسلام بە باشی داناوە، کە خواردن بۆ ماڵی خاوەن مردووەکە بکرێت، چونکە ماڵە مردووەکە لەبەر دڵتەنگی‌و خەمباریان، لەوانەیە نەتوانن بەم کارە هەڵسن. ئەمەش بە پێی ئەو گێڕانەوەی، کە ئەبوداود و ئیبن ماجەو ترمذي لە عبداللّەی کوڕی جەعفەر گێڕاویەتیانەوە، کە گوتویەتی: پێغەمبەری

خوا ﷺ فەرمویەتی: ((إصْنَعُوا لآلِ جَعْفَرَ طَعاماً فإنَّهُ قَدْ أتاهُمْ أمرٌ يَشْغَلُهُمْ ...خواردن بۆ ماڵی جەعفەر[1] دروستکەن، چونکە ئەوان شتێکیان بەسەر هاتووە، کە وای لێکردوون سەرقاڵ بن‌و نەتوانن چێشت دروستکەن)).

ج- بەدەرنەخستنی دڵ خۆشی‌و ڕووخۆشی بەرامبەر ئەو کەسانەی، کە پرسەنامەیان لێ‌دەکەی، یان دڵیان دەدەیەوە:

لەکاتێك یەکێك دەمرێ مسوڵمانی پابەندی دینی خوا، هەرگیز کارێکی وا ناکات کە خەڵك بە سوکی سەیری بکەن‌و بە خراپە باسی بکەن‌و ئیسلامیشی پێ ڕەش‌و ناشیرین بکات، بەڵکو لەم کاتەدا دڵنەوایی کەسوکاری مردووەکە دەداتەوە چ بە ئایەت بێ، یان بە فەرمودە شیرینەکانی پێغەمبەر ﷺ، یان بە بەسەرهاتێکی واقیعیانەی ئیسلامی. لەم کاتانەشدا پێ‌ناکەنێ‌و تەنانەت خەندەشی نایەتە سەر لێوو قسەی پڕوپووچ ناکات‌و نوکاتی پێکەنین هێنەر ناکات.

---

١) جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب لە جەنگی (مؤتە) شەهید بوو.

هەروەها بە شێوازێکی نەرمو نیانو کارامەو لێهاتوانەو بە دڵێکی پڕ لە تەقواوە ئامۆژگاری ئامادەبوان دەکات.

## ئـەدەب و ئاكـاری مسـوڵمـان لە كاتی پژمین و باوەشـك دان

لەو ئادابو رەفتارە جوانانەی ئیسلامی خۆشەویستمان بۆی داناوین، كە لەناو كۆمەڵگا پیادەی بكەین، ئادابی پژمین و باوەشكە، كە پێویستە خۆمان و منالەكانیشمان فێر بكەین بەو شێوەیەی، كە پێغەمبەری خوا ﷺ رێنمویی كردووە.

أ- كاتێك مسوڵمانێك دەپژمێ و دەڵێ: الحمدلله پێویستە پێی بڵێی یَرْحَمُكَ الله ، ئەویش بڵێ: یَهْدیَكُمُ الله ویُصْلِحْ بالَكُمْ.

ئەمەش بە پێی ئەم گێرانەوەی، كە بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە -رەزای خوای لێبێ- گێراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ، كە فەرمویەتی: ((إذا عطس أحدكم فَلْیَقُلْ: الحمد لله، وَلْیَقُلْ أخُوهُ أو صاحِبُهُ: یَرْحَمُكَ الله، فإذا قالَ لَهُ، یَرْحَمُكَ الله، فَلْیَقُلْ یَهدیكم الله وَیُصْلِحْ بالكُمْ))،

وە لە گێڕانەوەیەکی ئەبو داودو ترمذي هاتووە، کە بڵێ: ((يَغفِرَ الله لَنا وَلَكُم)).

**ب- ئەو کەسەی دەپژمێ، گەر نەیگوت (الحمد لله) تۆ پێی نالێی یرحمك الله:**

ئەمەش وەك موسلیم لە ئەبی موسا -ڕەزای خوای لێبێ- گێڕاوەتیەوە، کە گوتویەتی: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((إذا عطس أحدكُم فحمد الله فَشَمِّتوهُ، فإذا لَمْ يَحْمَدِ الله لا تُشَمِّتُوهُ ...گەر یەکێك لە ئێوە پژمی و سوپاسی خوای کرد، واتە: گوتی الحمدلله، ئێوەش دوعای پژمینی بۆ بکەن، واتە بڵێن: یرحمك الله، بەڵام گەر پژمی و نەیگوت الحمدلله، ئەم دوعایەی بۆ مەکەن)).

هەروەها بوخاری و موسلیم لە ئەنەسەوە -ڕەزای خوای لێبێ- دەگێڕنەوە، کە گوتویەتی: ((عَطَسَ رَجلانِ عِنْدَ النبّي ﷺ فَشَمَّتَ أحدَهُما ولَمْ يُشَمِّتَ الآخَر. فقال الذي لَمْ يُشَمِّتْهُ: عَطِسَ فلانٌ فَشَمَّتَهُ وعَطَستُ فَلَم تُشَمِّتْني؟ فقال عليه الصلاة والسلام: هذا حَمَدَ الله، وأنتَ لَمْ تَحمد الله:

دوو پیاو لەلای پێغەمبەر پژمین، یەکێکیان گوتی: الحمدلله و دوعای پژمینی بۆکرا. بەڵام ئەوی دی نەیگوت: الحمدلله و دوعای پژمینی بۆ نەکرا. جا ئەو کەسەی دوعای پژمینی بۆنەکرا گوتی: فلانەکەس پژمیو دوعای پژمینی بۆکرا، کەچی من پژمیمو دوعام بۆ نەکرا؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (چونکە پیاوەکەی دی، کە پژمی گوتی: الحمدلله، بەڵام تۆ سوپاسی خوات نەکرد.

جا وا باشە گەر یەکێك پژمیو نەیگوت الحمدلله بە بیری بهێنرێتەوە، کە ئایا سوپاسی خوای کردووە، یان نا.

**ج- لەکاتی پژمینا واباشە دەست، یان دەستەسڕێك بخرێتە سەر دەمو، بە گوێرەی توانا نەهێڵرێ دەنگی زۆر بێت.**

ئەمەش وەك پێشەوای ئازیزمان محمد ﷺ ئەم ڕەوشتە جوانەی لەخۆی هێناوەتە دی، وەك ئەبو داودو ترمذي لە ئەبو هورەیرەوە -ڕەزای خوای لێبێ- گێڕاویەتیانەوە، کە گوتویەتی: ((كان رسول الله ﷺ إذا عطس وَضَعَ يَدَهُ أو ثَوبَهُ على فَمِهِ. وَخَفَض- أو غَضَ - بها صَوتَهُ

...پێغەمبەری خوا گەر پژمیبایە دەستی، یان کراسەکەی دەخستە سەر دەمی‌و دەنگی نزم دەکردەوە)).

هەروەها ئیبن السني لە عبداللەی کوڕی زوبەیری دەگێڕنەوە، کە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((**إنَّ الله عزَّ وجلّ يَكرهُ رَفْعَ الصوت بالتثاؤبِ والعَطّاس** ...خوای بەرزو مەزن پێی ناخۆشە لەکاتی باوەشك‌و پژمیندا دەنگ بەرز بکرێتەوە)).

لەڕاستیدا زۆر کەس هەن لەناو مەجلیسێك، یان لەلای هەر کەسێکدا کاتێك دەپژمێ بە شێوەیەکی ناشیرین دەنگی بەرزدەکاتەوە، تەنانەت پرپشکی پژمینەکە ئەدات بەدەوروبەریدا، دیارە ئەمە ئاکارێکی ناپەسەندو ڕەفتارێکی سوکە، خوای گەورە حەز بەو کارە ناکات.

**د- گەر یەکێك لە سێجار زیاتر بپژمێ پێی نالێن: يرحمك الله.**

وەك موسلیم‌و ئەبو داودو ترمذي لە سەلمەی کوڕی ئەکوەع -ڕەزای خوای لێبێ- دەگێڕنەوە، کە گوتویەتی: ((**عَطَسَ رجُلٌ عِنْدَ رسول الله ﷺ وأنا شاهِدٌ، فقال رسول**

**الله ﷺ: يرحمك الله، ثم عَطس الثانيـة أو الثالثـة، فقـال رسول الله ﷺ يَرحمك الله، هـذا رَجُـلٌ مزكـوم** ...پیاوێـك لەلای پێغەمبەر پژمی‌و منیش لەوێ ئامـادەبووم‌و ئاگـام لـێبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: يرحمك الله، پاشان بۆ دووەمین‌و سێیەم جار پژمی‌یەوە، دیـسان پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرمووی: يرحمك الله ، ئەم پیاوە توشی هەڵامـەت بووە)).

لەبەرئەوە گەر یـەکێك لـە پـاش سـێجار پـژمی پـێی ناگوترێ: يرحمـك الله. وەك ئـیبن الـسني لـە ئـەبوهورەیرە دەگێڕێتەوە، کە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خـوا ﷺ بـوو دەیفەرمو: ((**اذا عَطَسَ أحدكم فَلْيُـشَمِّتْهُ جَليـسُهُ، واذا زادَ عَنْ ثلاثة فَهُوَ مزكوم، وَلاَ يُشَمَّتْ بَعْدَ ثَـلاثٍ**: گەر یـەکێك لە ئێوە پژمی با ئەوەی لەگـەڵی دانیـشتووە، پـێی بڵـێ: يرحمك الله، بەڵام گەر لە سێجار زیاتر پژمی ئەوە تووشـی هەڵامەت بووە، یەکێکیش لە پاش سێ جار بپژمێ، پـێی ناگوترێ يرحمك الله.

**هـ- گەر ئامسوڵمان پژمی وا باشە پێی بڵێی: (یهدیکم الله):**

ئەمەش وەك ئەبو داودو ترمذي لە ئەبو موسای ئەشعەری -ڕەزای خوای لێبێ- دەگێڕێتەوە، کە گوتویەتی: **((کان الیَهود یَتعاطسون عِندَ رسول الله ﷺ یرجون أن یقول: یرحمك الله، فیقول: یهدیکم الله ویصلح بالکم** ...جولەکەکان لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەپژمین و بە ئاوات بون پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: **یرحمك الله**، واتە: خوا ڕەحمتان پێبکات. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرمو: ((**یهدیکم الله ویصلح بالکم**))، واتە: خوا هیدایەتتان بدات و ئەحواڵتان باش بکات)).

**و- گەر ئافرەتێکی نامەحرەم پژمی، واباشترە، کە پێی نەڵێی: (یرحمك الله)**

بۆچونی زۆر لە زاناو موجتەهیدان ئەوەیە، گەر ئافرەتێکی بێگانە (نامەحرەم) واتە: (جگە لە دایك و خوشك و ژن و پوورو کچەزاو ژنی باوك) بپژمێ، کەراهەتی

هەیە بە ڕادەیەکی حەرام کـە پیـاوی بێگانـە پـێی بڵـێ: یرحمك الله. بەڵام گەر ئافرەتەکە پیر بوو ئەوەیان قەیناکـە. دیارە ئەمەش بۆیە کەراهـەتی هەیـە، تـا دەرگـای ڕێگـا خۆشکردنی گوناهو تاوان داخرێ.

ئیبن الجوزی دەڵێ: لە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلـەوە وەرمان گرتووە، کە پیاوێکی خواناس‌و خواپەرسـت لـەلای بـووە، جـا ژنەکـەی ئیمـام ئەحمـەد پـژمیوە، پیـاوە خواناسەکەش پێی گوتوە: یرحمك اللّه، ئیمـام ئەحمـەدیش گوتویەتی: خواناسێکی نەزانە بەوەی، کە کەراهەتی هەیـە بە ئافرەتێکی بێگانە بگوترێ: یرحمك اللّه.

ئەمانەی باسکران سەبارەت بە پژمین بوو، بەڵام ئاداب‌و ڕەفتای مسوڵمان لەکاتی باوەشکدا بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

**أ- بـە گوێرەی توانـا نـەهێڵرێ باوەشـك بێتـەوەو دەم نەکردنـەوە:**

ئەم ئاداب‌و ڕەفتارەی ئێستا باسی دەکەین، ئاکـارێکی جوانی ئیسلامی کۆمەڵایەتییە، کە کەسی لـێ نابوێردرێ، کە ئەویش باوەشکە.

دیارە لەکاتی باوەشکدا دەم کردنــەوە، شـێوەی مرۆڤــ چەند ناشیرین دەکاتو کەسایەتی مرۆڤـ دێنێتە خوارەوە.

جا بۆ ئەم مەبەستە پێغەمبــەری خــوا ﷺ مەنهــەجو ڕێرەوی داناوە، تا مسوڵمانان لەنێو خۆیاندا پیادەی بکەنو منالەکانیــشیان لــێ بەهرەمەنــد بکــەنو بــە خــەڵکی بسەلمێنن، کــە ئیــسلامە تاکــە بەرنامــەی شارســتانیەتو ڕۆشنبیری، نەك ڕۆژئاوای بەناو ڕۆشنبیر.

ئــەبو هــورەیرە -ڕەزای خــوای لێبــێ- گوتویــەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ اللهَ يُحِبُّ العَطَّاسَ، وَيَكْرَهُ التثاؤُبَ، فإذا عَطَسَ أحدُكُمْ وحَمِدَ الله تعالى، كان حقاً على كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أن يقول لَهُ: يرحمك الله، وأما التثاؤب فإنما هو من الشيطان، فإذا تثاءَبَ أحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ ما استطاع، فإن أحدكم اذا تثاءَب ضَحِكَ مِنْهُ الشيطان: خوای گەورە پژمینی خۆش دەوێو حەزی بە باوەشك نیــە، گەر یەکێك لە ئێوە پژمیو گوتی: الحمدلله، ئــەوا لەســەر هەر مسوڵمانێکە، کە گوێ بیستیەتی پێی بڵــێ: یرحمك الله، باوەشك هاتنەوە لــە لایــەن شــەیتانەوەیە، جــا گــەر

یەکێکتان باوەشکی هاتەوە، با بیگەڕێنێتەوە بە گوێرەی توانا و نەهێڵێ باوەشکی بێتەوە. چونکە کاتێك یەکێك لە ئێوە باوەشکی دێتەوە، شەیتان گاڵتەی پێ دەکات و پێی پێ دەکەنێ))[1].

**ب- گەر باوەشك هات دەست لەسەر دەم دابنێ:**

ئەمەش وەك موسلیم لە ئەبی سەعیدی خودری -ڕەزای خوای لێبێ- دەگێڕێتەوە، کە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((**إذا تثاءَب احدكم فَلْيُمسك بيده على فَيه فإنَّ الشيطان يُدْخلُ**: گەر یەکێك لە ئێوە باوەشکی هات، با دەستی لەسەر دەمی دابنێ، چونکە شەیتان لەوێوە دەچێتە ژوورەوە)).

جا زۆر لە زانا و موجتەهیدان وای بەباش دەزانن، کە لەکاتی باوەشك هاتن لە نوێژدا دەست بخرێتە سەر دەم.

**ج- دەنگ بەرزنەکردنەوە لەکاتی باوەشکدا:**

وەك موسلیم و ئەحمەد و ترمذي گێڕاویانەتەوە، کە

---

١) بوخاری گێڕاویەتیەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((إن الله يحب العطاس ويكره التثاؤب فإذا تثاءَب أحدكم فلا يقل هاه ...هاه، فإن ذلك مِنَ الشيطان يَضْحَكُ مِنْهُ ...خوای گەورە پژمینی خۆش دەوێ‌و حەزی لە باوەشك نیە، جا گەر یەکێکتان باوەشکی هات، با نەڵێ: ها ها، چونکە ئەمە لە شەیتانەوەیەو پێی پێدەکەنێ)).

ئیبن السیني لە عبداللەی کوڕی زوبەیرەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((إنَّ الله عزَّ وجلَّ يكره رفع الصوت بالتثاؤب والعطاس ...خوای گەورە حەز بە باوێشك‌و پژمینی بەدەنگەوە ناکات)).

ئیتر لە کۆتاییدا داوا لە گشت مسوڵمانێك دەکەم، یەکەمیان لەخۆمەوە، بەم ئەدەب‌و ئاکارە جوان‌و بەرێزانەی ئیسلام، ئاکارو کردەوەکانمانی پێ برازێنینەوەو پەیوەندی کۆمەڵایەتیمانی پێ بەهێز بکەین.

هەڵبەت ئەم ئادابو یاساو ئاکارانەی ئیسلام، سەنگی مەحەکی مسوڵمانە، کە دەتوانێ لە کۆمەڵگەکەیدا پیادەی بکات‌و، بە خەڵکانی عەلمانی خۆ ناز بە

ڕۆشنبیری، بسەلمێنێ، کە ئەم ئاکارو ئادابانە پێوەری ڕاستەقینەی ڕۆشنبیری‌و مەدەنیەتە، نەك زانستێکی ڕوتی ڕەق‌و وشك.

داواکارم لە خوای بەخشندە کە دڵەکانمان... کردەوەکانمان... گوفتارمان.. ئاکارو ڕەوشتمان وا لێبکات بەپێی شەریعەتە بێوێنەکەی خۆی بکات‌و، گوناهو تاوانەکانمان لەسەر شان هەڵگرێ‌و بیخاتە سەر شانی موشریکان‌و کافران‌و دوژمنانی خۆی.

ئێمەش بە بەهەشتی ڕازاوەو دڵڕفێن شاد بکات. ئامین.

  

## سەرچاوەکان:

١- تربية الأولاد في الإسلام، د. عبدالله ناصر علوان.
٢- أدب المسلم في العبادات والمعاملات والعادات المعاصرة، محمد سعيد بيض.
٣- منهج التربية النبّوية للطفل، محمد نور بن عبدالحفيظ سويد.
٤- آداب المسلم، عبدالرحيم ماردني، دار المحبة، دمشق.
٥- منهاج المسلم، أبوبكر جابر الجزائري.
٦- صلة الأرحام ثوابها وفضلها والتحذير من قطعها –مجدي محمد الشهاوي- الطبعة الأولى ١٩٩٩ مكتبة الإيمان للنشر والتوزيع

# ناوەرۆك